


چیرۆك بۆ منالآن

* * * * * * * * * * * * * * * *

# له ماڵ و له قوتابخانه دا



چیرۆك نووسی سۆڤیەتی

ن . نۆسۆف

دایناوه

محمدی مەلاکریم

لەعەرەبی یەوە کردوویە بەکوردی

له چاپخانەی ( الاجیال ) له بەغدا لەچاپدراوه

١٩٧٥

# له ماڵ و له قوتابخانه دا

## چیرۆك بۆ منالآن


چیرۆكنووسی سۆڤیەتی

**ن . نۆسۆف**

داینـــاوه

محمدی مەلاکریم

له عەرەبیەوه كردوویه به كوردی



دەزگای ( هاوكاری ) یارمەتیی داوه بۆ لەچاپدانی

---

له چاپخانەی ( الاجیال ) له بەغدا لەچاپدراوه

١٩٧٥



پێشکەش بێ بە منالآنی کورد ..

هیواکانی دوارِۆژی نەتەوەو نیشتمانەکەیان

ـ وەرگێر ـ

# بەشی یەکەم



وەخت بەسەرچووەو تازە ناتوانم بکەڕێمەوە دواوە • پشووی هـاوین وا دوایی دێو ئەبێ بڕۆمەوە بۆ قوتابخانە • هاوینم هـەموو بە فتبۆلێنو هـەلخستنەوە بەسەر شـەقامەکانا بردەسـەر • خۆ کتێب هـەر بە خەیالیشما نەهاتووە بیری لێ بکەمەوە • بەلێ جـاروبار هەندێ کتێبم خوێندوەتەوە ، بەلام هیچیان کتێبی دەرز نەبوون ، کتێبی چیرۆكو سەرگوزەشتە بوون • کتێبی ڕێزمانو ژمارە هەر سەیریشم نەکردوون • ڕێزمان هەر بە جارێ دەسم لێ هەلگرتووەو وازم لێ هێناوە • ژمـارەیش هیچ خۆشم لێی نایەت ، چونکە لێکدانەوەی پرسیارم لە هـەموو شتێ لا ناخۆشترە • (ئاواز خـان)ی مامۆستامان ئەیویست هەندێ ئەرکم لە دەرزی ژمـارەدا بدا بەسەردا تا لە پشووی هاویندا خۆمی پێوە خـەریك بکەم ، بەلام بەزەیی پیامدا هاتەوەو ، خستمیە پۆلی چوارەمو هیـچ ئەرکێکی زیادەی نەخستە ئەستۆم • پێی وتم :

— نامەوێ پشـووی هاوینەکەت لێ تێك بدەم • هەر بەم حالەی ئیستاتەوە سەرت ئەخەم• بەلام ئەبێ گفتم بدەیتێ خۆت لـە مـاوەی پشوودا تەماشای کتێبی ژمارەکەت بکەیتو پیا بچیتەوەو ڕەوانی بکەیت •

منیش گفتم دایەو سوێندم بۆ خوارد ٠ بەڵام هەر کە خوێندن دوایی هات، بابی پوولێ ژمارەم لەیادنەماو لاشمولایە تا نەگەڕێنمەوە قوتابخانە هەر بیریشی لێ ناکەمەوە٠ بەڕاستی خۆم بە شـەرمەزار ئەزانم کەوا گفتەکەی خۆمم نەهێنایەدی ٠ بەڵام تازە بڵێم چی؟ هەل لەکیس چوو٠

وا پشووی هاوین بەسەرچوو٠ بەیانی‌یەکیان ـ بەیانی‌ی یەکەم ڕۆژی سالی تازەی خوێندن ـ سبەینێ زوو لە خەو هەستامو کتێبەکانم خستە ناو جانتاکەمو چووم بۆ قوتابخانە ٠ چالاکیو هەڵسووڕان لەم ڕۆژەدا بەئاشکرا بە شەقامەکانەوە دیارە ٠ کوڕو کچ ، گەورەو بچووك ، بەسەر جادەکاندا بڵاو بوونەتەوەو بۆ قوتابخانە ئەڕۆن ٠ هەندێکیـان یەکە یەکە ئەڕۆنو هەندێکیشان جووت جووت ٠ تاقمێکی‌تریشـیان بـە کۆمەڵ ئەڕۆن ٠ هی‌وایشیان هەیە سستەو بە پەلە ناڕوا وەك من ٠٠ کۆمەڵێکی‌تریشیان ئەوەندە بە هەڵەداوان ئەڕۆن ئەڵێی ئاگر بەربووەتە ماڵیان ٠ منـاڵەکان چەپکەگوڵیان هەڵگرتووە پۆلەکانی قوتابخانەی پێ برازێننەوە٠ کچو کوڕ قیڕە قیڕیان دێو داویانەتە قاقای پێکەنین هەموویان شـادمانو دڵخۆشن٠ منیش هەروەها شادمانو دڵخۆشم٠ زۆرم پێخۆشە تیپی وردیلە پێشەنگەکانی خـۆم بدۆزمەوەو چـاوم بە هـەموو وردیلەکانو بە ( کامەران ) ی ئـامۆژگاری‌کەرمان بکەوێتەوە کە پار سەرپەرشتی‌ی ئـەکردینو پێمـانەوە خەریك ئەبوو ٠ وا هەست ئەکەم دەمێکە چـووم بۆ سەفەرێکی دوورو وا ئێستا ئەگەڕێمەوە بۆ مـاڵو نیشتمانەکەم ئەبینمەوەو چاوم بە کەسو کارم ئەکەوێتەوە ٠٠

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکم کەم بوو بۆئەوەی بەتەواوی دڵشاد بم٠ ئەزانم ئیتر بە هیچ جۆرێ لەناو ئاوەڵە کۆنەکانی قوتابخانەکەمدا

( میدیا ) ی دۆستی گیانی بەگیانیم نابینمەوە کە پار پێکەوە لەسەر تەختەیەك دائەنیشتین لە پۆلدا • ماڵی باوکی ( میدیا )، لەمدواییەدا ئەم شارەیان بەجێ‌هێشتو ، بە هیچ کلۆجێك نازانم ئاخۆ جارێکی‌تر چاومان بە ناوچاوی یەك ئەکەوێتەوە یا نە ؟ زیاتریش ئەوە دڵگرانم ئەکا نازانم ئەگەر ( ئاواز خان ) لێی‌پرسیمەوە : « لە ماوەی پشوودا بە دەرزەکانی ژمارەداچوویتەوەو ڕەوانت کردن؟ » چی‌ی پێ بڵێم • ئاخ لە دەست ئەم دەرزی ژمارەیە، ئیسراحەتی چۆن لێ تێك‌داوم .

خۆر بە ناوجەرگەی ئاسمانەوە، وەك لە هاویندا، تیشك ئەداتەوە • بەڵام شنەیەکی فێنکی پاییزەی هەیە کەڵا زەردەکان بە دارەکانەوە دائەوەرێنێ‌و هەندێك بە حەواوە ئەمدیوو ئەودیویان پێ ئەکاو پاشان ئەیانخاتە زەوی • بایش بەسەر پیادە ڕەوەکاندا ئەیانداتە بەر وەك بڵێی ئەوانیش پەلەی ڕۆیشتنیان بێ •

لـــە دوورەوە پارچە قوماشێکی سوور بەســەر دەرگای قوتابخانەکەمانەوە دیـارە • چوار دەوری بە گـــــــوڵ گیراوەو بە پیتی گەورەی سپی لێی نووسراوە : « بە خێر بێن ! » . پاریش هەر لەم ڕۆژەدا قوماشێکی سووری‌وا هەڵواسرابوو • پێراریش هەروەها• بەڵکو لەبیرمە هێشتـا کە منالیش بووم‌و بۆ یەکەمجار هاتبوومە قوتابخـانە ، قوماشێکی‌وا هەڵواســرابوو •• هەموو ئەم ساڵانەم لەیادە •• ئـای کـە لە پۆلی یەکەمدا بووم چـەندم هـەوڵ ئەدا ! بە ئـاواتی ئـەوەوە بووم زوو پێ‌بگەم‌و گەورە ببم‌و بێمـــە ڕیزی پێشەنگە وردیلەکانەوە •!

هەموو ئەمانەم دێتەوە یادو دڵەکوتەم پێ ئەکەوێ، وەك تووشی شتێکی زۆر خۆش هاتبم ! قاچەکانم لە خۆیانەوە لە جاران بە پەلەتر ئەڕۆن بە ڕێدا •• ئەبێ وریای خۆم بم نەکەومە ڕاکردن • ئەبێ بیر لـە

حالی خۆم بکەمەوە . من ئیستا قوتابی‌یەکی پۆلی یەکەم نیم . چوومەتە پۆلی چوارەم . ئەمە شتێکی گرنگە گاڵتەی پێ ناکرێ !

حەوشەی قوتابخانەکەمان پڕە لە قوتابی . بوون بە چەند کۆمەڵ . قوتابی‌ی هەر پۆلێك بەجیا ڕاوەستاون . گورج دەستم کرد بە گەڕان بەدوای کۆمەڵەکەمدا . برادەران دیمیانو بە هەڵەداوان هاتن بەدەممەوەو لە خۆشی‌یاندا کردیان بە گاڵەگاڵ .. دەستیان ئەهێنا بە شانو پشتما . هیچ بە تەمای ئەوە نەبووم ئەوەندە پێیان خۆش بێ چاویان پێم بکەوێتەوە ..

( شێرکۆ ) لێی پرسیم :

— ئەی ( میدیا ) لەکوێیە ؟

ئەوانی‌تریش هەموو هاواریان کرد :

— بەڕاست ئەی ( میدیا ) لەکوێیە ؟ ئێوە هەمیشە پێکەوە ئەبوون . لەکوێ ونت‌کرد ؟

وەڵامم دانەوە :

— ( میدیا ) ڕۆییوەو ئیتر جارێکی‌تر لەگەڵ ئێمەدا نایەتەوە ناو پۆل .

— بۆچی ؟

— ماڵی باوکی باریان کردووەو ، دیارە ئەویش لەگەڵیانا ڕۆییوە .

— ناشێ ؟

— بۆ ناشێ ؟ چی‌ی تیایە ؟

( پشکۆ ) پرسی :

— بە ڕاست ؟

— درۆت لەگەڵ ناکەم .

منداڵەکان بە زەردەخەنەیەکی سلەوە سەیرێکیان کردم .

( بەختیار ) وتی :

— کوڕینە ( ئازاد ) یش لێرە نی یە .

لەملاو لەولاوە دەنگ بەرز بووەوە :

( سوارە ) یش هەر دیار نی یە .

( ئاشتی ) دوایی بە قسەکانیان هێناو ، وتی :

ڕەنگ بێ هەموویان ڕۆیشتبن و کەس ئاگای لە کەسیان نەبێ .

وەك بلێی یەکێك وەڵامان بداتەوە ، کورج دەرگاکە کرایەوەو ( ئازاد ) خۆی کرد بەژوورا . لە هەموولایەکەوە هاوار بەرز بووەوە : « هەلاو !.. ئەی یاخوا بەخێر بێ ی !. » و مناڵەکان خۆیان دا بەسەریا .

( ئازاد ) ئەیویست خۆی لە ناوەانا دەرباز کا . کەوتە هاوار هاوار :

— لێم گەڕێن . . ئەڵێی هەرگیز بنیادەمتان نەدیوە !

بەڵام هەرکامان لە عاستی خۆی ئەیویست دەس بە شان و پشتیا بێنێ. منیش هەروەها . بەڵام بە بێ ئەوەی خۆم بمەوێ ، دەستێکم دا بە پشتی ملیا .

( ئازاد ) بە تووڕەیی یەکەوە هاواری کرد :

— ئای ! ناشێ بتانەوێ لێم دەن ؟ .

ویستی خۆی دەرباز کا لە دەستمان . بەڵام ئێمە کەمارۆیەکی توندمان دابوو ..

نازانم ئەگەر ( سوارە ) نەی کردایە بە ژوورا مەسەلەکە چۆن ئەبڕایەوە .

بە هاتنی ئەو مناڵەکان هەموو لە کوڵکی ( ئازاد ) بوونەوەو

دایان بەسەر ئەودا ..
( ژیان ) وتی :
— لاموایە ئیستا کەسمان کەم نی‌یە .
( ئارام ) وەڵامی دایەوە :
— ( میدیا ) نەبێ .
— ئەو کەماڵیان باری کردبێ چون ئەتوانین بیژمێرین ؟
— رەنگبێ وابێ . لە (ئاواز خان) ئەپرسین .
منیش وتم :
— باوەرم پێ بکەن یا نەیکەن ، من ئەبێ بۆچ درۆتان لەگەڵ بکەم ؟

ئەنجا منالەکان کەوتنە بەسەرکردنەوەی یەکتری‌و دەسیان کرد بە گێرانەوەی سەرگوزەشتەی خۆیان بۆ یەکتر کەوا هاوینی رابوردوویان چۆن بەسەر برد . هەندیکیان چووبوون بۆ ئۆردووگای پێشەنگە وردیلەکان . هەندیکیشیان لەگەڵ باوکو دایکیان چووبوون بۆ لادێ . هەموویان لە پار گەورەتر بووبوونو پێستیان رەش هەڵگەرابوو . بەڵام لە هەموویان رەشتر ( نەوزاد ) بوو کە ئەتوت دراوەتە بەر دووکەڵو ، جگە لە برژانگە شەلەکانی هیچ بە ناوچاویەوە نەمابوو تیشك بداتەوە ..
( ئاشتی ) لێی‌پرسی :

— لەکوێ وا رەش هەڵگەراوی ؟ دیارە هاوینت لە ئۆردووگای پێشەنگە وردیلەکاندا بردووەتەسەر .
— نەوەڵلا .. پێشان لە ئۆردووگا بووم ، پاشان چووم بۆ ( قرم ) .

— چۆنت توانی ؟

— شتەکە گران نییە . کارگە باوکمی نارد بۆ حەسانەوەو ،
باوکیشم بڕیاری دا منو دایکم لەگەڵ خۆی بەرێ .

— کەواتە لە ( قرم ) بووی .

— بێ گومان .

— دەریات دی ؟

— دەریام دی .. هەموو شتێکم دی .

منداڵەکان دەوری ( نەوزاد ) یان داو کەوتنە خێسە لێ کردنی ..
( سوارە ) قیڕاندی :

— کەواتە بۆمان بگێڕەوە : دەریا چۆنە .. بڵێ .. بۆ دەنگت
لە دەم دەرنایە ؟

— دەریا ؟ دەریا زۆر گەورەیە .. ئەوەندە گەورەیە لەمبەریەوە
بوەستی ئەوبەری نابینی . لەمبەریەوە گوێ ئاو هەیە ، بەلام
لەوبەریەوە هیچ دیار نییە .. ئای .. لە ئاو بەولاوە هیچ نییە ..
خۆریش ئەوەندە بەتینە لەوانەیە لەشی بنیادەم ببرژێنێ .. هەتاوەکو
من پێستی لەشم لێ بووەوە .

— ڕاست ناکەی ..

— بە سەری باوکم .. هەتاوەکو ~~لەپێشەوە~~ ترسیشم لێ نیشت .
بەلام پاشان زانیم لەژێر پێستی یەکەمەوە پێستێکی تر هەیە . ئیستا
بەم پێستەی ترمەوە ئەسووڕێمەوە ..

— باشە ، جارێ باسی دەریامان بۆ بکە .. باسی پێستی
خۆتمان بۆ مەکە .

— کە گەیشتمە سەر دەریا سەرنجم دایە پیاوی لێ ئەترسێ ..
ئاو دەریاکەی پڕ کردووە .. دەریا پڕە لە ئاو ..

نازانم ئەگەر (کامەران) نەهاتایە باسی چیتری بو ئەکردین. کە ( کامەران ) هات بوو بە هەرا . منالەکان هـەموو دەوریاندا . هەرکەس ئەیویست سەرگوزەشتەی خۆیی بۆ بگێڕێتەوە. لێمان پرسی ئاخـۆ ئەمســـالیش هـەر خۆی ئامۆژگاریکەرمان ئـەبێ ، یا یەکێکیترمان بۆ دائەنرێ ..

— وەرن کوڕینە ! مادەم دڵتان لێم نەیەشابێ ناتاندەمە دەستی کەسیتر .. ئەمسالیش وەك پار پێکەوە ئیش ئەکەین ..

لە هەمولایەکەوە دەنگ بەرز بووەوە :

— دلمان لێت یەشابێ ؟ هەرگیز شتیوا ڕوو نادا . ئێمە هەمیشە ئەوەمان پێخۆشە لەگەل تۆ بین .

( کامەران ) سەرگوزەشتەی خۆی بۆ گێڕاینەوە کە چۆن هاوینی ڕابوردوو لەگەل ئاوەلە کەمسەمۆلیەکانیا سواری بەلەمێکی لاستیك بوونو لە زێ پەڕینەوە . ئیتر پاش ئەوەی پێیوتین « بەم نزیکانە بەیەك ئەگەینەوە » ، بەجێیهێشتینو چوو بۆلای ئاوەلەکانی لە پۆلە بەرزەکانا . ئەیویست هەموو برادەرەکانی بەسەر بکاتەوەو قسەیان لەگەل بکا .

پێمان ناخۆشبوو ڕۆیی . بەلام هەر پاش ڕۆیشتنی ئەو ( ئـاواز خان) هات . گشتمان دلمان کرایەوەو بە یەك دەنگ هاوارمان کرد :

— بەیانیت باش ( ئاواز خان ) !

— بەیانیتان باش ڕۆلەکانم ! هیوام وایە هاوینێکی خۆشتان بەسەر بردبێ .

— ئەرێ وەلا ، ( ئاواز خان) ، خۆشمان ڕابوارد .

— باشیش حەسانەوە ؟

— ئەرێ وەڵلا باشیش حەساینەوە ..

— ئەی تەواو نەحەسانەوە ؟

— بەڵێ وەڵلا ( ئاواز خان ) تەواو حەساینەوە . ئیستاش ئەمانەوێ ئیش بکەین .

— زۆر باشە .

( پشکۆ ) وتی :

— ( ئاواز خان ) ، من ئەوەندە حەساومەتەوە لە حەسانەوە ماندوو بووم . ئەگەر زیاتر بحەسامایەتەوە لەوانەبوو نەخۆش بکەوم .

— ( پشکۆ ) تۆ هیچ نەگۆڕاوی .. ئەمساڵیش هەر وەك پار سوعبەتچیو قسەخۆشی ..

— ئەرێ وەڵلا ( ئاواز خان ) من هەمیشە حەز لە سوعبەت ئەکەم ، بەڵام کەمێك گەورە بووم ..

— ( ئاواز خان ) بە پێکەنینەوە وتی :

— کەمێك ؟ زۆر !

دوابەدوای ئەو ( یاوەر ) وتی :

— بەڵام ئەم گەورە بوونەی لە جاران زیرەکتری نەکردووە . پۆلەکە هەموو دایە پێکەنین .

( دڵخواز ) بە دەنگێکی بەرز وتی :

— ( ئاواز خان ) ، ئیتر ( میـدیا ) نایەت بۆ ئەم قوتابخانەیە .

— ئەزانم . ماڵیان باری کردووە . چوون بۆ مۆسکۆ .

— ئاواز خـان ) ، ( نەوزاد ) چووە بۆ ( قرم ) و دەریای دیوە .

— شتی چۆکە . لە دمرزی داهاتوودا (نەوزاد) باسی (قرم)مان

بۆ ئەگێڕیتەوە .

— ( ئاواز خان ) ، ( نەوزاد ) پێستی خۆی ونکردووە .

— کێ ؟

— ( نەوزاد ) !

— باشە ، زۆر جوانە ! پاشان باسی ئەمەم بۆ بگێڕنەوە . ئێستا ڕیز بن . وەختی ئەوە هاتووە بچینە پۆلەوە .

ئێمەش‌و هەموو پۆلەکانی‌تریش ڕیزمان بەست . بەڕێوەبەری قوتابخانە مامۆستا ( گۆران ) هاتە سەر سەکۆی بەر قوتابخانەکە . پیرۆزبایی بە بۆنەی گەڕانەوەمانەوە بۆ قوتابخانە لێ کردین‌و ، هیوای سەرکەوتنێکی باشی لەم ساڵە تازەیەماندا بۆ دەربڕین . ئەنجا مامۆستاکان دەسیان کرد بە دابەش کردنی قوتابییەکان بەسەر پۆلەکانیدا . قوتابییە هەرە بچووکەکان بۆ پۆلی یەکەم . ئەنجا قوتابییانی پۆلی دووەم‌و سێهەم . پاش ئەوانیش نۆرە هاتە سەر ئێمەو ئەنجا گەورەکان .

( ئاواز خان ) بردینیە پۆلە تازەکەمان . هەموو بڕیارمان دا هەر یەك لە جێـکەکەی پاریا دانیشێ . لەبەرئەوە من بەتەنها خۆم تەختەیەکم بەرکەوت . هەموو وامان هەست ئەکرد کە پۆلەکـە کەلێك لە جاران بچووکترە لە بەرچاو .

( ئاواز خان ) ئەمەی بۆ لێك‌داینەوە ، وتی :

— پۆل هەر پۆلەکەی جارانە . پانی‌و درێژیی هەر ئەوەندەی ئەوسایە . بەڵام ئێوە لە ماوەی ئـەم هاوینـەدا گەورە بوون‌و پۆلەکانتان بچووك دێتە پێش چاو .

ئەمە ڕاستە . کە لە دەرزی یەکەم بووینەوە لە پشوودا چوومە

پۆلی سێیەم . دیم کوتومت وەك پۆلی چوارەمەکەی خۆمان وایە .

هەر لە سەرەتای دەرزدا ( ئاواز خان ) ئاگاداری کردین کە ئەبێ لە پۆلی چوارەمدا زیاتر هەوڵ بدەین ، چونکە پرۆگرامی ئەمسال پرە لە دەرز . جگە لە رێزمانو ژمارەو دەرزەکانیتری پار ، جوغرافیاو ئەشیاو مێژوویش هەیە . ئەبێ هەر لە سەرەتاوە بە باشی بخوێنین . پرۆگرامی سەعاتەکانی دەرزمان دانا . ئەنجا ( ئاواز خان ) پێیوتین ئەبێ سەرۆکی پۆلو یارمەتیدەری سەرۆکی پۆل هەڵبژێرین .

— ( نەوزاد ) سەرۆکی پۆل بێ ، ( نەوزاد ) !

— مەیکەن بە هەرا .. نازانن هەڵبژاردن چۆن ئەبێ ؟ ئەوەی ئەیەوێ قسە بکا پەنجەی هەڵبرێ ..

بەگوێرەی ئوسوول دەسمان کرد بە هەڵبژاردن . ( نەوزاد )مان هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتیی پۆلو ( شیرین ) مان کرد بە یارمەتیدەری .

سەعات دوو ( ئاواز خان ) پێیوتین : بۆئەوەی دەس بکەین بە دەرز خوێندن ، ئەبێ چاو بە دەرزەکانی پارماندا بگێرینەوە تا هەرکەس هەرچیی لە یاد نەماوە بیهێنێتەوە یادی . من کورج دەستم پێکرد . جەدوەلی لێکدانم لەیاد چووبووەوە . هەمووی تا دواییەکەی . تا ٧ × ٧ = ٤٩م لە یاد مابوو . لەوەولا هەمووم لێ تێکچووبوو .

( ئاواز خان ) وتی :

— ئای ( شاخەوان) ! ئای ! وادیارە بەدرێژایی ئەم هاوینە کتێبێکت نەگرتووە بەدەستەوە .

( شاخەوان ) لەقەبی بنەماڵەکەمانە . ( ئاواز خان ) کە ڕقی لێم هەڵئەستێ وام بانگ ئەکا . کە لەگەڵیشم ئاشت بێ بە ناوی خۆمم ناو ئەبا : ( شاهۆ ) .

سەرنجم داوە هەمیشە لە سەرەتای ساڵی خوێندندا فێر بوون زۆر بەزەحمەت دێتە پێش چاو . نازانم بۆچ ؟ دەرزەکان وەك درێژ بن وا دیار ئەکەون . وەك بڵێی بە قەستی وایان دانێن . ئەگەر من سەرۆکی بەرزی قوتابخانەکان بوومایە هەوڵم ئەدا بۆئەوە نەیەڵم بەجارێ دەس بە هەموو دەرزەکان بکرێ ، بەڵکو وردە وردە دەستم پێ ئەکردن ، تا منداڵەکان کەم کەم خووی بێکاری یان لەبیر بچێتەوەو فێری خوێندن ببنەوە . بۆنموونە بەمجۆرە : لە هەفتەی یەکەمی کردنەوەی قوتابخانەدا ڕۆژی یەك دەرز بخوێنرێ . لە هەفتەی دووهەما بکرێ بە دوو دەرز . لە هەفتەی سێیەمدا بکرێ بە سێ و بەمچەشنە بڕۆن تا هەموو دەرزەکان پڕ ئەکەنەوە . یا بەمجۆرە : لە هەفتەی یەکەمدا تەنها دەرزە ئاسانەکان بلێنەوە وەك دەرزی وەرزش . لە هەفتەی دووهەمدا دەرزی سروودیشی بخەنەسەر . لە هەفتەی سێیەمدا دەرزی ڕێزمانیش بلێنەوە . ئیتر بەمجۆرە بڕۆن تا سەرە دێتە سەر دەرزی ژمارەیش . ڕەنگە بێ هەندێ کەس بڵێن من تەمەڵمو حەزم لە خوێندن نییە ، بۆیە ئەم پێشنیارە ئەکەم ، بەڵام ئەمە ڕاست نییە . من زۆرم حەز لە خوێندنە . ئەوەندە هەیە زۆرم لا گرانە کوتوپڕ تێهەڵچم . بەدرێژایی هاوین خەریکی ڕابواردن بووبم ، کەچی ئیستا لەپڕ پێم بڵێن : هۆپ ! خەریکی چیت ؟ یەڵلا ئەبێ دەس بکەیتەوە بە خوێندن ..

سەعات سێ دەرزی جوغرافیامان هەبوو . لاموابوو جوغرافیا

دەرزیـێکی زۆر گرانە وەك دەرزی ژمارە . کەچی دیم جوغرافیـا
باسی ئەم زەوی یە ئەکا کە تیا ئەژین . باسی شـاخو ڕووبارو
دەریاو ئوقیانووسەکانیەتی . پێشان وام ئەزانی زەوی وەك سینی ی
حەلوا تەختە . . بەلاّم ( ئاواز خان ) تێ ی گەیاندین کە وەك تۆپ
خڕە . پێشان ئەمەم بیستبوو ، بەلاّم بە درۆو سـاختەم ئەزانی .
وا ئیستا تێ گەیشتم ڕاستەو درۆ نی یەو زانست ئیسپاتی کردووە کە
زەوی خڕەو تۆپێـکی زۆر گەورەیە خەلّكو هـەموو گیـان لەبەران
بەکۆلیەوە ئەژینو ئەم هەموو شتەی بەسەرەوەیەو ئەوانەش کە لە
بنیەوە ئەژین ناکەونە خوارەوە . سەیر ئەوەیە ئەوانەی کەوتوونەتە
بنی تۆپەکەوە کە ئەڕۆن بە ڕێدا قاچیان ئەکەوێتە سەرەوەو
سەریان ئەکەوێتە بنەوە . کەچی خۆیشیان هەست بەوە ناکەنو
وائەزانن بەشێوەیەکی عادەتی بەڕێوە ئەڕۆن. ئەگەر سەر دانەوێننو
بڕوانن بۆ بەرپێ ی خـۆیان زەوی ئەبینن . ئەگـەر هەلیشی بڕن
ئاسمان ئەبیننو وا تێ ئەگەن بە شێوەیەکی عادەتی ڕێگا ئەبڕن .

کەمێك وەختمان بە جوغرافیاوە بردەسەر . بەلاّم لە دواسەعاتا
شتێکی سەیرمان بۆ هات . زەنگ لێدراو ( ئاواز خـان ) کردی
بە ژوورا . کە دەرگاکە کرایەوە سەیرمان کرد قوتابی یەك
لای کەوشکەنەکەدا وەستاوە ، کەسمان نەمان ناسی ، دیار بوو
شلەژابوو . سەلامێکی لە ( ئاواز خان ) کردو وتی :

— بەیانیمە باش !

( ئاواز خان ) وەلاّمی دایەوە :

— بەیانیت باش ! ئەتەوێ قسەم لەگەل بکەی ؟

— نەخەیر .

— ئەی بۆچی هاتووی ؟

— هەروا .

— تێ نەگەیشتم .
— هاتووم بخوێنم . ئەمەتە پۆلی چوارەم ؟
— بەڵێ ئەمەتە .
— منیش پۆلی چوارەمم ئەوێ .
— دیارە تازەی ؟
— بەڵێ تازەم .
( ئاواز خان ) سەیرێکی دەفتەری پۆلی کردو لێی پرسی :
— ناوت ( هیوا ) یە ؟
— بەڵێ ناوم ( هیوا ) یە ، بەڵام ( کوردە ) م بانگ ئەکەن .
— ( کوردە ) بۆچی درەنگ هاتی ؟ نازانی ئەبێ هەر لە بەیانی یەوە لە قوتابخانەدا بی ؟
— هەر لە بەیانی یەوە هاتووم ، بەڵام لە دەرزی یەکەم دواکەوتم .
— لە دەرزی یەکەم ؟ ئیستا دەرزی چوارەمە . ئەی ئەو دوو دەرزەکە لەکوێ بووی ؟
— لەوێ .. لە پۆلی پێنجەم ..
— چی کەیاندیتیە پۆلی پێنجەم ؟
— هەر کە گەیشتمە بەرەوە زەنگ لێی دا . منالەکان دەس بەجێ چوونە ژوورەوەو منیش شوێنیان کەوتم . تەماشا ئەکەم لە پۆلی پێنجەمدام . کە دەرز دوایی هات منالەکان لێیان پرسیم : « تازەی ؟ » وتم : « بەڵێ » . ئیتر هیچیان نەوت . بۆ دەرزی پاشەوە تێ گەیشتم کە لە پۆلی خۆما دانەنیشتووم . مەسەلەکە بەم جۆرە بوو .
( ئاواز خان ) وتی :

— دانیشە ، بەڵام جارێکی‌تر پۆلی خۆتت لێ تێك نەچێ .
( کوردە ) هات‌و لای منا دانیشت ، چونکە من بەتەنها بووم‌و جێگایەکی چۆڵ لەپاڵمەوە بوو ..

لە تێکڕای کاتی دەرزدا منالەکان هەر لایان ئەکردەوە بە لایداو بە ئاستەم پێ‌ئەکەنین. بەڵام ئەم هیچ گوێی نەئەدایەو دیمەنی وابوو وەك هیچ ڕووی نەدابێ لێ‌ی . لێوی خوارووی کەمێك بۆ پێشەوە دەرپەڕیبوو ، هەروەها لووتیشی کەمێك قنج بوو . ئەمە دیمەنێکی ناشیرینی دابوویە وەك بڵێ‌ی فیز بکا .

پاش دەرز منالەکان کۆمەڵیان لێ‌کرد . ( سۆران ) لێ‌ی‌پرسی :
— چی گەیاندیتیە پۆلی پێنجەم؟ ئەی مامۆستا بانگی نەکردی؟
— ڕەنگ بێ لە دەرزی یەکەمدا بانگی کردبم ، بەڵام من لە دەرزی دووهەما گەیشتم .

— چۆن ئەبێ سەرنجی نەدابێ قوتابی‌یەکی تازە هاتووەتە دەرزی دووهەمەوە ؟

— لە دەرزی دووهەما مامۆستایەکی تازە دەرزی ئەوتەوە . لەوێ وەك پۆلی چوارەم نی‌یە . هەر دەرزێك مامۆستایەکی تایبەتی‌ی هەیە، تا هەموو قوتابی‌یەکانی پۆلەکەی ئەناسێ ئاژاوە لە پۆل نابڕێ.
( نەوزاد ) وتی :

— ئەم ئاژاوەیە هەر لەگەڵ تۆ ڕووی داوە . لەگەڵ کەسی‌تر ڕووی نەداوە . هەرکەس ئەبێ ڕێگای پۆلی خۆی بزانێ .
— بەلام من چونکە تازەم . . .

— مادەم تازەی نەئەبوو دواکەوی . ئەنجا خۆ زمانت نەبڕاوە ، نەت‌ئەتوانی بپرسی ؟

— کەی‌بپرسم ؟ من کە گەیشتمە بەرەوە دیم منالەکان ڕائەکەنە ژوورەوە بۆ ناو پۆلو منیش هەر ئەوەم پێ کرا بە ڕاکردن دوایان کەوم . .

— لەوانەبوو بکەویتە پۆلی دەهەمیش !

( کوردە ) زەردەخەنەیەکی کردو وتی :

— نەء . لە پۆلی دەهەمدا گورج هەستم ئەکرد . ئەوان کەورەن .

کتێبەکانم هەڵگرت بێمەوە بۆ ماڵ . لە دالآنی قوتابخانەکەدا تووشی ( ئاواز خان ) بووم . پێی‌وتم :

— باشە ( شاهۆ ) ئەمساڵ ئەتەوێ چۆن بخوێنی ؟ دۆستە بچکۆلەکەم وەختی ئەوە هاتووە بەڕاستی هەوڵ بدەی . ئەبێ خۆت بە دەرزی ژمارەوە خەریك بکەی . لە پارەوە تۆ لە دەرزی ژمارەدا لاوازی . بەڕاستی شوورەیی‌یە تۆ جەدوەلی لێکدان نەزانی . تەنانەت قوتابیی پۆلی دووهەم جەدوەلی لێکدان ئەزانێ . .

— منیش ئەیزانم . تەنها ئەوەندەیە کەمێکی بەشی دواییم لێ لەبیرچووەتەوە .

— ئەبێ هەمووی بەتەواوی بزانی . ئەگینا ناتوانی دەرزی ژمارە بخوێنی . لە ئیستاوە تا سبەینێ هەمووی لەبەرکەو ، سبەینێ گوێت لێ ڕائەگرم .

# بەشی دووەم



کچان هەمیشە خۆیان زۆر بە زیرەك ئەزانن • نازانم بۆچی باوەڕیان وایــە . ( لاولاو ) ی خوشــکە بچکۆلەم چووەتە پۆلی سێهەمو ئیســتا خۆی وا دائەنێ هیچ پێویســـتی بە گوێ بــۆ شل کردنم نی یە ، وەك بلێی من برا گەورەی نەبمو دەســـەڵاتم بەسەریا نەمابێ . چەند جار داومە بە گوێیدا باش نی یە هەر کە لە قوتابخانە گەڕایەوە بکەوێ بەسەر کتێبەکانیاو ئەو ئیشانەی دراون بەســەریا جێبەجێیان بکا . قوتابی بەدرێژایی سەعاتەکانی دەرز لە قوتابخانەدا مێشـکی ماندوو ئەبێ . پێویستە ماوەی بدرێ ســەعاتو نیوێ ، دوو ســـەعات ، پێش دەس کردنەوە بە ئیش بحەسێتەوە . بەڵام ئەو، ئەم قسانەم هیچ نەچوون بە گوێیداو هەرگیز نەیویستووە بی‌یان بیسی !.

سەیر ، سەیر ! ئیستاش کە گەڕامەوە بۆ ماڵ ئەبینم کتێبەکانی بەسەر مێزەکەدا بڵاو کردووەتەوەو خەریکی خوێندنە . پێم‌وت :

ــ گیانـــە ، ئەوە خەریکی چیت ؟ نازانی پاش گەڕانەوە لە قوتابخانـــە ، قوتابی ئەبێ مـــاوەیەك لـــە مێشـــکی گەڕێ ، بحەسێتەوە ؟

کەچی ئەو چۆنم وەڵام ئەداتەوە :

— ئەزانم ، بەڵام ئەمە باشترە . من زوو ئیشەکانی خۆم ئەکەم‌و لێ ئەبمەوە‌و دڵم بۆ خۆم ڕەحەت ئەبێ . پاشان ڕائەبوێرم‌و هەرچیم ئارەزوو لێ بێ ئەیکەم ..

— ئای چەند کەللەڕەق‌و تێنەگەیشتووی .. پاریش بۆم ڕوون کردیتەوە . چیت لێ بکەم کە تۆ ناتەوێ گوێ بۆ ئامۆژگاری‌ی برا گەورەی خۆت شـــل بکەی . کە بـە تەواوی کەودەن بوویت جا تێئەگەیت‌و چاوت بە خوت ئەکەوێ .

— چیت داوە لێم ؟ من تا ئەوەی لەسەر شـانمە جێبەجێی نەکەم دڵم دانامرکێ ..

— ناتوانی لەوەپاش بیکەی ؟ ئەتوانی .. هـــەر ئەوەنـدەت پێویستە کەمێك عەزمت جەزم بێ ..

— نەء . . وا باشـە ئیشەکانم زوو تەواو بکەم‌و پاشان بۆ خۆم لێی بحەسێمەوە . ئیشـــی ئێمـە وەك هی ئێوە زەحمەت نی‌یە . دەرزی ئێمە وەك دەرزی پۆلی چوارەم نی‌یە .

— دیارە ! دەرزی ئێوە وەك هی ئێمە نی‌یە . کە چوویتە پۆلی چواردم بە چاوی خۆت ئەیبینی چیت دێتە ڕێ !

— ئیشی ئەمڕۆت چی‌یە ؟

— ئەمە ئیشـــی تۆ نی‌یە .. وادیارە تۆ لە هیچ حاڵی نابی . منیش لەمەولا خۆم بە قسە کردنەوە لەگەڵ تۆ ماندوو ناکەم ..

لەگەڵ ئەمەشـا ناتوانم پێی‌بڵێم مـامۆستا جەدوەلی لێـکدانی داوەتێ پیا بچمەوە‌و لەبەری بکەم ، چونکە جەدوەلی لێـکدان لە پۆلی دووەما ئەخوێنرێ .

بڕیاری بەڕاستیتم دا هەر لە سەرەتاوە دەس بکەم بە ئیش . گورج دەسم کرد بە پیاچوونەوەی جەدوەلی لێکدان بە دەنگێکی نزم ، چونکە ئەبوو ( لاولاو ) گوێی لێم نەبێ ، بەڵام زۆری پێ نەچوو ( لاولاو ) لە ئیشی خۆی بووەوەو چووە دەرەوە بۆ یاری کردن لەگەڵ دەستە خوشکەکانی . ئیستا ئەتوانم بە دەنگێکی بەرز پیا بچمەوە . ئەوەنـدەی پیا چوومەوە بە باشی هاتەبەرم . ئەگەر نیوەشەو یەکێك لە خەو ڕامپەڕێنێ‌و لێم بپرسێ : ٧×٧ یا ٨×٨ = ؟ ئەتوانم بێ سێ‌و دوو وەڵامی بدەمەوە .

بۆ سبەینێ ( ئاواز خان ) بانگی کردم‌و لێی‌پرسیم تا بزانێ جەدوەلی لێکدانەکەم چۆن لەبەر کردووە . کە بێ هـەڵـە وەڵامم دایەوە ، وتی :

— ئەوەتە ! سـەیرکە ! ئەگەر خۆت بتەوێ بە ئارەزووی دل فێر ئەبێ . . من ئەزانم تۆ دەبەنگ نیت . .

بەڵام ئەوە خۆش ئەبوو ئەگەر تەنها پرسیاری جەدوەلی لێکدانەکەی لێ بکردمایە . بۆ نەگبەتی ناردیشمی بۆ سەر تەختەکە کە پرسیارێکی لەسەر نووسیبوو ، وڵامی بدەمەوە . دیـارە لەوێدا ئیتر کار گەن بوو .

چوومە سەر تەختەکە . ( ئاواز خان ) باسێکی لەبارەی چەند وەستایەکەوە بۆ کردم خانوویەك ئەکەنەوە . ژمارەکانم بە دەباشیر لەسەر تەختەکە نووسی‌و کەوتمە بیر کردنەوە . پرسیارەکە ئەوەندە قورس بوو بە هیچ جۆرێ ڕێـم پێ نەئەبرد . خۆم زۆر بـاش ئەوەم ئەزانی . تەنها ئەوەندەم پێ‌کرا ناوچاوی خۆم گرژ بکەم تا ( ئاواز خـان ) وا لێ‌بکەم وا تێ‌بگا بیر ئەکەمەوە ! لە ژێریشەوە بە تیلی چاو ئەمڕوانی بۆ ئاوەڵەکانم تا وەڵامەکەم پێ‌بڵێن . . دیارە

زۆر زەحمەتە یەکێ لەسەر تەختە وەستابێ‌و ئاوەڵەکانی لە دوورەوە وەڵامی پێ بڵێن .. مناڵەکان کەسیان ورتەی لە دەم دەرنەهات ..

( ئاواز خان ) وتی :

ــ زووکە .. پێم بڵێ .. ئەم پرسیارە چۆن لێك ئەدەیتەوە ؟ ئەبێ پێشان چی بکەی ؟ ناوچاوم زیاتر گرژ کردو نیمچە لایەکم بە لای پۆلەکەدا کردەوەو بە چاو ئیشارەتێکم کرد .. منـــاڵەکان تێ گەیشــتن کەوا تێ گیراوم‌و حاڵم شـلۆقە . دەسیان کرد بە فێر کردنم ..

ــ پۆلە پێی مەڵێن .. ئەگەر پێویست بێ من خـــۆم تێی ئەگەیەنم .

( ئاواز خان ) خۆی دەسی کرد بە لێکدانەوە بۆم . پێی وتم کە ئەبێ بۆ پرســیاری یەکەم چی بکەم ، بەڵام هیچی لێ تێ نەگەیشتم . لەگەڵ ئەوەشدا پرسیاری یەکەمم هەر لێکدایەوە .

ــ زۆر باشە ئێستا . ئەی وەڵامی پرسیاری دووەهەم چی یە ؟

دەسم کردەوە بە بیر کردنەوەو بە ئیشارەت کردن بە چاو بۆ ئاوەڵەکانم . قوتابی یەکان دەس بەجێ لەولاوە کەوتنە وەڵام دانەوە .

ــ بێ دەنگ بن ! کوێتم لە هەموو شتێکە . ئێوە هەر ئەتانەوێ عەزیەتی بدەن . خۆی دەسی کرد بە لێکدانەوەی پرسیاری دووەهەمیش .

بەم چەشنە ئاخری وردە وردە لە سایەی سەری ( ئاواز خان ) و پێ وتنی ئاوەڵە قوتابی یەکانمەوە پرسیاری دووەهەمیشم لێکدایەوە .

ــ ئێســـتـا حاڵی بووی ئەم جۆرە پرسـیارانە چون لێك ئەدرێنەوە ؟

-- بێ گومان !

ڕاستت ئەوێ هیچ تێنەگەیشتبووم . بەڵام شوورەییم لێ ئەهات پێ لەوە بنێم کە چوار پێم . ئەشترسام ئەگەر بڵێم هیچ تێنەگەیشتووم ( ئاواز خان ) نمرەی کەمم بۆ دابنێ . چووم لە جێگەکەی خۆما دانیشتمەوەو پرسیارەکانم لە دەفتەرەکەمدا نووسی یەوە . ئەبێ لە ماڵەوە بە وردی بیریان لێ بکەمەوە .

کە لە دەرز بووینەوە بە ئاوەڵەکانم گوت :

بۆچی بە دەنگی بەرز پێتان وتم تا ( ئاواز خان ) گوێی لێ بێ ؟ پێوتن کەی وا ئەبێ هەموو پۆلەکە گوێی لە دەنگتان بوو !

( جوامێر ) وەڵامی دامەوە :

- ئەی کە تۆ لەسەر تەختەکە وەستابی ئەبێ چۆنت پێ بڵێین ؟ ئاخ خۆزگە لە جێگەکەی خۆتدا بوویتایە !

- جێگەکەت . . جێگەکەت . . ئەبێ لە شوێنێ‌وادا دەنگ هەڵ نەبڕی !

- پێشان بە ئەسپایی پێم‌وتی ، بەڵام تۆ گوێت لێ نەبوو . .

- تۆ بە لووت قسەت ئەکرد !

- ئەوەتە ! بە دەنگی بەرز پێت ئەڵێین پێت ناخۆشە . . بە دەنگی نزمیش پێت ئەڵێین هەر پێت ناخۆشە . . نازانم ئەی چۆنت پێ بڵێین ؟ ئاسمان بەرزو زەوي نزم !

( ئازاد ) وتی :

- بە هیچ کامیان پێی مەڵێ . . با خۆی بیر بکاتەوەو بە تەمای ئەوە نەبێ کەس پێی‌بڵێ . .

ـ جا من مادەم هیچی لێ نەچێتە مێشکمەوە ، سەری خۆم بۆ بەم مەسەلانەوە بێشێنم ؟ !

ـ ( نەوزاد ) وتی :

ـ ناچێتە مێشکتەوە ، هی ئەوەیە خۆت ناتەوێ بچێتە مێشکتەوە . تۆ خۆت هیچ ناکەیتو هەر بە تەمـای ئەوەی خەڵك فێرت بکەن . . من لەمڕۆ بەدواوە هیچ بە کەس ناڵێم. ئەبێ ئوسوول لە پۆلەکەماندا تێك نەچێ . پێوتن کارێکی زیانبەخشە !.

وەڵامم دایەوە :

ـ هیچ پێویستێکم بە تۆ نی یە .

( نەوزاد ) وتی :

ـ هەرچۆن بێ هەولیـش ئەدەم بۆئەوەی نەهێـڵم کەس هیچ بە کەس بڵێ .

ـ جارێ تۆخوا تۆ ترو فیزمان بەسەرا مەکە !

ـ من ترو فیز ناکەم . من سەرۆکی پۆلمو هەوڵ ئەدەم لەمڕۆ بەدواوە کەس هیچ بە کەس نەڵێ .

ـ نابێ بەوە بنازی کە هەڵبژێرراوی‌و کراوی بە سەرۆکی پۆل . ئەمڕۆ تۆ سەرۆکی پۆلیو ، سبەینێ لەوانەیە من بم .

ـ هەرکاتێ هەڵبژێررای ئەبی بە ســەرۆك . بەڵام هێشـتا هەڵنەبژێرراوی . هەندێکیش لە قوتابی یەکان ڕای خۆیانیان دەربڕی . دەس کرا بە گفتوگۆ : پێوتن ئەبێ ببێ یا نـە ؟ بەڵام نەگەیشـتنە هیچ ئەنجامێك . (دڵخواز) بە ڕاکردن هات . زانیبووی کە قوتابی یە گەورەکان هاوین لەودیوی قوتابخانەکەوە تەختانێکیان خۆش کردووە

بۆ فتبۆلێن . هەموو بڕیارماندا پاش قاوەڵتی کردن بڕۆین بۆ ئەوێ بۆ یاری کردن .

کە قاوەڵتیمان کرد هەموومان لەو تەختانەدا کۆبووینەوەو دوو تیپی یاری کردنی ئوسوولیمان ڕێك خست بەڵام ئەندامانی تیپەکەی ئێمە لەناو خۆیاندا ڕێك نەکەوتن لەسەر ئەوە کێ ببێ بە گۆڵچی . کەس ئامادە نەبوو بۆئەوە قیت ڕاوەستێ بۆ چاوەڕوانی کردنی فتبۆلەکە . هەموو ئەیانویست بەدوای تۆپدا ڕابکەنو گۆل بکەن .. کشتیان بەجارێ داوایان لە من کرد ببم بە گۆڵچی ، بەڵام منیش حەزم ئەکرد یەکێك بم لە یاری کەرە هێرش بەرەکان یا هیچ نەبێ پشتگر بم . باش بوو کوردە هاتە پێشەوە وتی من ئامادەم ببم بە گۆڵچی . دەس بەجێ چاکەتەکەی داکەندو دەسی کرد بە یاری کردن ..

لە سەرەتای یارییەکەدا سەرکەوتن بۆ تیپەکەی بەرامبەرمان بوو کە هەمیشە هێرشی ئەکردینە سەر . تیپەکەی ئێمە کەوتبوە گێژاوی ئاژاوەو سەر لێشێواوییەوە ، هەر لە خۆمانەوە بە تەختانەکەدا ڕامان ئەکردو ، لەوە زیاتر کە خۆمان ئەزیەتی یەکترمان ئەدا هیچمان نەئەکرد. بەڵام باش بوو (کوردە)ی گۆڵچیمان یاری کەری چاك بوو ، وەك پشیلەو یۆز بازی ئەبردو هەڵی ئەخستەوەو تۆپەکەی ئەگرتەوەو نەی ئەهێشت ببێ بە گۆل .. دوایی تۆپەکە کەوتە دەستی ئێمەو گرتمانە گۆلەکەی ئەوان . بەرابەر بە هیچی

ئەوان گۆڵێکمـان کرد . ئەم سـەرکەوتنـە گەرمی کردینەوەو هانی داین هێرشەکەمان بەهێزتر بکەین و گۆڵێکی تریشمان کرد . بووین بە خـاوەنی دوو گۆڵ بەرابـەر بە هیچی ئەوان . بەڵام نەمزانی یارییەکە چۆن کەوتە تەختانەکەی ئێمە . کەوتینە



پەلەپەل کردن و سەرمان لێ تێکچوو . لەتوانامانا نـەما نەیەڵین تۆپەکە رووبکاتە گۆڵەکەمان . لەوکاتەدا ( کـوردە ) تۆپەکەی گرتەوەو رای کرد بۆ لای گۆڵەکـەی ئەوان و لەوێ تۆپەکەی خستە زەوی . ئەیویست لەعاسق خۆیا گۆڵێك بکا ، بـەڵام ( ئارام ) مەردانە لە چنگی دەرهێناو دای بە ( سۆران )و ئەویش دای بە ( ئازاد ) و بـەرلەوەی بتـوانین بـگەڕێینەوە دواوە تۆپەکە لە گۆڵەکەمان دەرچوو، ئەوانیش بوون بە خاوەنی گۆڵێك بەرابەر بە دوو گۆڵەکەی ئێمە . کەوتینە هەرا هەراو قیڕەقیڕو جنێودانی هەمەجـۆرە بە ( کوردە ) چونکە شوێنەکەی خـۆی بەجێ هێشتبوو . ( کوردە ) ویستی پاکانە بۆ خۆی بکاو گفتی داینێ کە لەوەودوا بەپێی ئوسووڵ بجووڵێتەوە ، بەڵام گفتەکەی خۆی نەبردە سـەر . هەمیشە جێـگای خـۆی بەجێ ئەهێشت . تاقمەکەی تریش لەمکاتانەدا هەر گۆڵیان لێ ئەکردین . یـارییەکە تا ئێوارەیەکی درەنگی خایاند . لەئەنجامدا ئێمە بووین بە خاوەنی شـازدە گۆڵ بەرابەر بە بیستویەك گۆڵی ئەوان. حەزمان ئەکرد دەس لە یارییەکە هەڵ نەگرین ، بەڵام تـاریك داهـاتبوو ، تۆپەکەمان نەئەبینی ، ئەبوو بگەڕێینەوە بۆ ماڵ . لە ڕێگادا منداڵەکان هەر ئەیانوت بەهۆی خـودسەری و بێ گوێیی ( کوردە ) وە بوو وا دۆڕاندمان .

( یاوەر ) بە ( کوردە ) ی وت :



-- بەراستی تۆ کۆڵچی‌یەکی چاکی. ئەگەر لەجێگەی خۆتا بمایتایەتەوە هەرگیز زاڵ نەئـەبوون بەسەرمانا . ( کوردە )یش وەڵامی دایەوە :

-- خۆم پێ ڕاناگیرێ . حەز لە باسکت‌بۆل ئەکەم. چونکە لە باسکت‌بۆلدا هەموو هەر ڕائەکەن بـەدوای گـۆڵداو ، کۆڵچی‌یان ناوێ . هـەر یاری‌کەرێ ئـەتوانێ تۆپەکە بـە دەستی خۆی بگرێ . وەرن با تیپێکی باسکت‌بۆل پێکەوە بنێین .

یاری‌یەکەی بۆ لێکدایەوە . بە واتەی ئەو باسکت‌بۆلیش هیچی لە فتبۆل کەمتر نی‌یە .

( یاوەر ) وتی :

-- ئەبێ قسە لەگەڵ مەشقدادەری پەروەردەکردنی لەش بکەین ، بەڵکو ئەو یارمەتیمان بدا شوێنێك بۆ یاری خۆش کەین . .

هـەر کە گەیشتینە لای باخچـەی گشـتی کە ئەبوو لەوێوە پێچ

بکەینەوەو بڕۆین ، ( کوردە ) هاواری لێ هەڵسا :

ــ چاکەتەکەم لە تەختانەکە لەبیرچووە .

بە ڕاکردن دوابەدوا گەڕایەوە . منالی‌وا هـەمیشە شـتی سەیری لێ ئەقەومێ !

سەعات لە هەشتو نیو تێنەپەڕیبوو کە گەڕامەوە مال . دایکم هەندێ هات بە سەرما ، بەلاّم من بۆم لێك‌دایەوە کە هێشتا زووەو ئێـــستا پایزەو ڕۆژگاري پایز لە هي هاوین کورت‌ترەو هاوین لەم‌کاتەدا هێشتا دنیا ڕۆشنە !

دایکیشم وتي تۆ لە هەموو شتێکا هـەر ئەملچی ئەکەی‌و گوێ بۆ کەس شل ناکەی‌و ، داوای لێ کـردم کە ئیشەکانم جێ‌بەجێ بکەم . منیش بە گوێم کرد ، بەلاّم نەك دەس‌بەجێ . یاری ماندووی کردبووم‌و ئەبو کەمێك بحەسێمەوە .

( لاولاو ) لێ‌ی‌پرسیم :

ـ بۆچی دەرزەکانت نانووسیتەوە ؟ ها ، لە کەیەکەوە مێشـکت ئەحەسێتەوە ؟

ـ من خۆم باشتری لێ ئەزانم مێشکم ئەبێ چەند بحەسێتەوە ..

دیارە ناتوانم ئیستا دەس‌بەجێ دەس‌بکەم بە ئیش ، چونکە لەوانەیە لاولاو وابزانێ ئەو ناچاری کردووم . کەمێك حەسامەوەو باسی ئەوەم بۆ ( لاولاو ) گێڕایەوە کە چۆن ( کوردە ) چاکەتەکەی لە شوێن یاری‌یەکەدا لەبیرچوو .. زۆری پێ‌نەچوو باوکیشم گەڕایەوە ، باسی ئەوەی بۆ کردین کە چەند داوا هاتووەتە سەر فابریقەکەیان بـــۆ دروست‌کردنی مەکینەی نوێ وەك دروست کـردنی ڕیزە مەکینەیەك بـــۆ ئێسگەی کارەبای ئاوی‌ی ( کۆیبیچێف ) . قسەکانی

باوكم زۆر خۆش بوون ، لەبەرئەوە نەمتوانی بەجێی بێڵم‌و پێم‌نەکرا دەرزەکانم بنووسمەوە ..

باوكم ئیشی نموونە دروست‌کردنە لە فابریقەی پۆڵا دارشتندا . یانێ چی نموونە دروست ئەکا ؟ کەس ئەوە نازانێ ، بەڵام من ئەیزانم .. بەرلەوەی پارچەیەك پۆڵا داڕێژرێ ئەبێ نموونەی ئەو پارچەیە لە دار دروست بکەن . نموونە ئەمەتە . بەڵام ئەم نموونەیەیان بۆچی‌یە ؟ مەبەس لە نموونە ئەوەیە ئەهێنرێ‌و ئەخرێتە ناو جۆرە پاکەتێکی ئاسن بێ‌بنەوەو خۆڵی تێ‌ئەکرێ . کە نموونەکە دەرئەکێشرێ خۆڵەکە بۆی بووە بە قاڵب . ئەنجا پۆڵا تواوەکە ئەکرێتە ناو ئەو قاڵبە . کە سارد بووەوە پارچە پۆڵاکە وەك نموونەکە دروست بووە . جا کە داوای پارچەیەکی تازە ئەکرێ لە فابریقەکەیان ئەندازیارەکان نەخشەکەی ئەکێشن‌و نموونە دروست‌کەرەکانیش لەسەر ئەو نەخشەیە نموونەکەی دروست ئەکەن . نموونە دروست‌کەر ئەبێ زۆر زیرەك بێ . ئەبێ بەپێی وێنەیەکی سادە ئەو نموونەیە دروست‌کا کە پێویستە . ئەگەر باشی دروست نەکا پارچە پۆڵاکە داناڕێژرێ .
باوكم نموونە دروست‌کەرێکی زۆر زیرەکە ، هەتاوەکو مشارێکی کارەبایشی دروست کردووە بۆ بڕینی پارچە داری بچکۆلەو ، ئیستا خەریکی ئەوەیە مەکینەیەکی‌وا دروست بکا بتوانێ نموونەکانی پێ ساف بکا . تائیستاش نموونەکان بە دەست ساف ئەکرێن ، بەڵام کە باوکم مەکینەکەی دروست کرد هەموو نموونە دروست‌کەرەکانی‌تریش کەڵك لە ئیشەکەی ئەو وەرئەگرن . باوكم عادەتی‌وایە کە لە ئیش ئەگەڕێتەوە تۆزێ ئەحەسێتەوە ، ئەنجا ئیتر یا خەریکی نەخشەی مەکینەکەی ئەبێ یا دەس‌ئەکا بە خوێندنەوە بۆ ئەوەی فێری ئەو شتانە ببێ کە پێویستە بی‌یانزانێ ، چونکە ئاسان نی‌یە بە تەنها خۆی مەکینەیەکی ساف‌کەر دروست بکا .

باوکم شێوی کردەوەو هەڵسا چوو بۆ سەر ئیشەکەی خۆی .
منیش دەسم کرد بە پیاچوونەوەی دەرزەکانم . پێشان لە جوغرافیاوە پیا هاتم چونکە لە هەموو دەرزەکان ئاسانترە لام . پاش ئەو هاتمە سەر دەرزی ڕێزمان . ڕستەیەك هەیە ئەبێ



بینووسمەوە چونکە ئەبێ ڕیشەی وشەکانی بدۆزمەوەو بزانم لە بەرو دوایەوە چی زیادەی هاتووەتە سەرو بە ژێر ڕیشەکانیانا خەتێك بکێشمو بە ژێر زیادەکانی بەرەوەیاندا دوو خەتو بە ژێر زیادەکانی دواوەیاندا سێ خەت .
ئەنجا هاتمەسەر دەرزی ئینگلیزیو کە لەویش بوومەوە هاتمە سەر دەرزی ژمارە . ئەو پرسیارەی مامۆستا بۆی دانابووم زور گرانو ناڵەبار بوو ، هەرچیم کرد وەڵامەکەیم نەزانی . سەعاتێك خەریکی بووم وەختبوو چاوم کوێر بێ ، هەر بیرم لێ ئەکردەوە کەچی هیچم دەسگیر نەئەبوو . هەستم کرد زۆرم خەو دێ ، چاوم وەك خوێی تێ کرابێ وا هاتبوە ژان .

دایکم پێی وتم :

ــ بەسە ، ئیتر وەختی خەوە . چاوت نووساوە . خەو ئەتباتەوە .

ــ باشە ، بەڵام ئەی سبەینێ چۆن بچم بۆ قوتابخانە بێ ئەوەی ئیشەکانی خۆم جێبەجێ کردبێ ؟

دایکم وەڵامی دامەوە :

قوتابی بە ڕۆژ ئەخوێنێ نەك بە شەو . ئەمە خوویەکی بەدە تۆ گرتووتە . کەڵکی هیچی نیە بۆت . ئەمەی ئیستە خەریکیی هیچی لێ حاڵی نابی .

باوکم بە دایکمی وت :

— وازی لێ بێنـە ، با نەخەوێ . ئەم شـەونوخونی‌یە ئاخری فێری ئەکا دەس لەوە هەڵـگرێ کە ئیشی رۆژی بهێڵێتەوە بۆ شەو .

دیسانەوە پرسیارەکەم خوێندەوە . چەند جاری‌تریش خوێندمەوە . وام لێ‌هاتبوو چاوم رەشکەو پێشکەی ئەکرد . تیپەکان لە بەرچاوما هـەڵیان ئەخستەوەو بازبازێنیان بـوو وەك بلێی چاوشارکێم لەگەڵ بکەن . چاوم هەڵ‌کلۆفت ، بەڵام تیپەکان دانەمرکانەوە ، بەڵکو ئەمجـارە وایان هەڵ‌ئەخستەوە وەك بلێی بەسەر پشـتی منداڵدا باز ئەدەن . .

دایکم لێی‌پرسیم :

— کامەی نازانی ؟

— دایە ، پرسیارەکە ! .. زۆر بەدە ..

— پرسیاری بەد لە دنیادا نی‌یە ، قوتابی‌ی بەد هەیە ..

دەسی‌کرد بە خوێندنەوەو لێکدانەوەی پرسیارەکە بۆم .. بەڵام هیچی لێ حاڵی نەبووم ..

باوکم لێی‌پرسیم :

— چۆن ؟ لە قوتابخـانەدا ئەم جـۆرە پرسـیارانەیان بۆ لێك‌ئەداوێتەوە ؟

— ئەوەڵڵا ، بابە :

— سەیرە ! ئەودەمەی کە من قوتابی بووم مامۆستا هەمیشە لە پۆلدا پرسیارەکانی بو لێك‌ئەدایەوە ، ئەوجا خۆشمان کە ئەهاتینەوە بۆ ماڵەوە پیا ئەچووینەوە .

ـ ئەودەمە کە ئێوە ئەچوونە قوتابخانە وابوو . بەڵام ئێستا ( ئاواز خان) ی مامۆستای ئێمە گوێمان ناداتێو هیچمان بۆ لێك ناداتەوە . هەر ئەوەندەیە لێمان ئەپرسێو بەس !

ـ ئەگەر وابێ کە تۆ ئەڵێی من تێ ناگەم چۆنتان فێر ئەکەن ؟

ـ وامان فێر ئەکەن کە وتم !

ـ ( ئاواز خان )ی مامۆستاتان لە پۆلا چی پێوتن ؟

ـ هیچی پێ نەوتین . تەنها پرسیارێکی لەسەر تەختەکە بۆ نووسین..

ـ ئادەی پرسیارەکەم پیشاندە .

پرسیارەکەم پیشاندا کە لە ڕووی تەختەکەوە نووسیبوومەوە لە دەفتەرەکەمدا ..

ـ وەی وەی ! ئاوا مامۆستاکەت تاوانبار ئەکەی ! ئەم پرسیارەش دەق وەك ئەو پرسیارە وایە کە مامۆستا لەسەر تەختە بۆی نووسیونەتەوەو بۆی لێکداونەتەوە .

ـ لەکوێ ئەمە وەك ئەوە وایە ؟ لە پرسیاری سەر تەختەکەدا وەستان خانوو ئەکەنەوە ، کەچی لێرەدا تەنەکەچین سەتڵ دروست ئەکەن ..

ـ باوکم نەڕاندی بەسەرما :

ـ هەی دەبەنگ ! لە پرسیاری سەر تەختەکەدا ئەبێ بزانی بیستو پێنج وەستا بە چەند ڕۆژ هەشت خانوویان پێ ئەکرێتەوە . لێرەشدا ئەبێ بزانی شەش تەنەکەچی بە چەند ڕۆژ سیوشەش سەتڵ دروست ئەکەن . هەردوو پرسیارەکە وەك یەك لێك ئەدرێنەوە .

باوکم دەستی کرد بە لێکدانەوە بۆم کە چۆن لە پرسیارەکە

بکوژمەوە ، بەڵام من هەموو شتێکم لێ تێکچووبوو ، لە هیچ حاڵی نەنەبووم . ئاخری لێم تووڕە بوو .

— هەتیو ! تۆ چوار پێی ، چوار پێ .. چوار پێیش وەك تۆ نییە !

باوکم هەرگیز نازانێ پرسیار لێك بداتەوە . دایکم وتی : باوکت لە پەروەردە کردندا هیچ شارەزایی نییە . بۆئەوە دەستنادا بێ بە مامۆستا . لە نیو سەعاتی یەکەمدا بە هێمنی بۆی لێك ئەدامەوە، بەڵام پاشان کەوتە بێزاری دەربڕین و تووڕە بوون . ئیتر لەوکاتەوە نەمتوانی هیچی لێ تێ بگەم . بەسەر کورسییەکەوە وەك دار ڕەق و وشك ڕاوەستام .

باوکم لێی پرسیم :

— باشە ، کامەی تێناگەی ؟ پرسیارەکە هەمووی ئاشکرایە !

باوکم کە دیتی ناتوانێ بە قسە بۆم لێك داتەوە ، قاقەزێکی بەدەستەوە گرت و دەسی کرد بە نووسین ..

— سەیرکە ، زۆر ئاسانە ! پرسیاری یەکەم ئەبێ کامە بێ ؟

خۆی پرسیارو وەڵامەکەی لەسەر قاقەزەکە نووسی ..

— ئیستا تێ گەیشتی ؟

ڕاستت ئەوێ هیچ تێ نەگەیشتبووم .. خەو ئەی بردمەوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وتم :

— حاڵی بووم ..

باوکم زۆری پێخۆش بوو ، وتی :

— ئەوەتە ! هەر بە هێمنی بیر بکەرەوە ، لە هەموو شتێ ئەگەیت .
ئەنجا وەڵامی پرسیاری دووەمی بۆ نووسیم :

— ئەی لەمە گەیشتی ؟

— تێ گەیشتم !

— ئەگەر تێ نەگەیشتووی بڵێ ، با جارێکی تریش بۆت لێک دەمەوە .

— نا ، نا ، تێ گەیشتووم ..

ئەمجار هەر خۆی وەڵامی پرسیاری سێهەمیشی بۆ نووسیمەوەو ،
دەفتەرەکەم هەڵگرت و خستمە ناو جانتاکەم .

( لاولاو ) ئەو پەندەی پێشینانی بۆ هێنامەوە کە ئەڵێ : ئیشی ئەمڕۆت
مەخەرە سبەی .

لە ژێر لێوەوە پێم وت :

— قەزام بکەوێ لە گیانت . سبەینێ چاوت بە خۆت ئەکەوێ و
دوو کەلیمە قسەم ئەبێ لە گەڵتدا ..

ئیتر چوومە ناو جێگاکەم و لێی نووستم ..

# بەشی سێهەم

قوتابخانەکەمان



لە ماوەی پشووی هاویندا تازە کرابوەوەو دیوارەکانی سپیکاری کرابوون . پاكو رۆشن بووبوەوە بەڵەکی هیچ پێوە نەمابوو . چاو لە تەماشا کردنی تێر نەئەبوو . هەر بەمچەشنە هەمو شتێ تازە بوو . بنیادەم حەزی ئەکرد هەر لە پۆلیوا رۆشنو گەورەدا بخوێنێ . بنیادەم لە پۆلیوادا وەك ئەڵێن ـ هەمیشە دڵی بە دنیا خۆش ئەبوو ..

بەڵام هەر کە سبەینێی رۆژی دووەم گەیشتمە قوتابخانە سەیر ئەکەم وێنەی دەریاوانێك لای تەختەکەدا بە خەڵوز لە دیوارەکە کێشراوە ، کراسێکی خەتخەتی لەبەر کردووەو پانتۆڵێکی گەورەی لە پێدایەو شەپقەیەکی ناوەتە سەری‌و قلیانێکی بە دەمەوەیە دووکەڵ لە سەرەکەیەوە ئەوەندە بەرز بووەتەوە ئەڵێی لە کەرەنای پاپۆرەوە دەرئەچێ . هەرکەس چاوی بەو وێنە بکەوتایە خۆی لەبەر پێکەنین پێ رانەئەگیرا .

( جوامێر ) پێی‌وتم :

— ( ئارام ) ئەم وێنەیەی کێشاوە . بەڵام ، ها ! ئاگات لێ بێ بە کەس نەڵێیت !

— لەبەرچی ؟

کە قوتابییەکان لەسەر تەختەکانیان دانیشتن و وێنەکەیان دی دەسیان کرد بە پێکەنین . هەندێکیان کەوتنە گاڵتە کردن ، ئەیانوت :

— شتی چاکە ! دەریاوانێك هاتووەتە پۆلەکەمانەوە . .

بەرلەوەی زەنگ لێ بدرێ ( کوردە ) بە ڕاکردن هات ، وێنەکەم بە دیوارەکەوە پیشاندا :

— ئەو دەریاوانە ئەبینی ؟

سەیرێکی کرد . پێم وت :

— ئەمە ( ئارام ) کێشاویەتی ، بەڵام بە کەس نەڵێی !

— چاکە . ئەزانم . دەرزی ڕێزمانەکەت نووسیوەتەوە ؟

— ئەی چۆن ؟ مـن تا هەموو ئیشـەکانم تەواو نەکەم ، نایەمە پۆلەوە .

— وەڵڵا من نەمنووسیوەتەوە . نەمتوانی بینووسمەوە . ئا توخوا دەفتەرەکەتم بدەرێ با لەبەری بنووسـمەوە .

— کەی ئەینووسیتەوە ؟ وا دەرز دەس پێ ئەکا .

— قەیدی نییە . لەکاتی دەرزدا ئەینووسمەوە . .

دەفتەرەکەم دایە . دەسی کرد بە نووسینەوە . لێی پرسیم :

— ئەرێ ئەوە بۆچی لە وشەی « کردنەوە » دا تەنها خەتێکت بەژێر هەموو وشەکەدا کێشاوە ؟ خۆ یەك خەت بە ژێر وشەیەکدا ئەکێشرێ کە زیادەکەی بە خۆیەوە بێ .

— چەند کەودەنی ! بۆچی نازانی « کردنەوە » ش زیادەکەی بە خۆیەوەیەتی ؟

— زیادەکەی « کرد » ەکەیەتی ؟ وا نی‌یە ؟

— « کرد » ەکە ڕیشەکەیەتی . بە زیادەکەیەوە ئەبێ بە « کردنەوە » .

— ئەی زیادەکەی کامەیە ؟

— « نوون » و « هێ » و « واو » و « هێ » کەی‌تریەتی .

— کەواتە زیادەکەی بە خۆیەوەیەتی . ئەمە بۆیە دوێنێ هیچی لێ حاڵی نەئەبووم ، وام‌ئەزانی زیادەکەی بەجیایە .

— نەگبەت ! خۆ ئەمەمان لە پۆلی سێهەمدا خوێند . .

— لەبیرم‌نەماوە . تۆ دڵنیای کە ڕاستە وایە ؟ تۆ چۆنت نووسیوە ، منیش هەر وای ئەنووسمەوە .

وبستم ڕیشەو زیادەکەی بەرودوای بۆ لێك‌بدەمەوە . کوتووپڕ زەنگ لێ‌یداو ( ئاواز خان ) کردی بە ژووردا .

چاوی بە وێنەی دەریاوانەکە کەوت کە لە دیوارەکە کێشرابوو . . ڕووی گرژ بوو ، وتی :

— ئەم شەڕە پشیلەیە چی‌یە ؟

— یەکە یەکە تەماشای هەموومانی کرد . پرسی‌یەوە :

— کێ ئەم وێنەیەی کێشاوە ؟

کەس ورتەی لە دەمەوە نەهات . دیسانەوە پرسی :

— کێ ئەم دیوارەی وا خراپ کردووە با پێی‌لێ‌بنێ ..

ئەمجارەش کەس وەڵامی نەدایەوە . ( ئاواز خان ) ئەوەندەی‌تر ناوچاوی گرژ بوو ، وتی :

— ڕۆڵەکانم ! نازانن پۆل ئەبێ هەمیشە پاك‌و خاوێن بێ ؟ جا ئەگەر هەرکامتان بێت‌و وێنەیەك لە دیوارەکە بکا ، ئەنجامی چی ئەبێ ؟ ئەگەر حەز ناکەن لە پیسایی‌دا بژین ، چۆنتان پێ ناخۆش نی‌یە پۆلەکەتان پیس بێ ؟

لەم‌لاو لەولاوە یەك دوو کەسێك بە دوودڵی‌یەکەوە دەنگیان بەرز بووەوە :

— نەوەڵڵا حەز ناکەین پۆلەکەمان پیس بێ .

بەدوای ئەواندا ( ئاواز خان ) وتی :

— سا کەواتە پێم بڵێن ئەمە ئیشی کامتانە ؟

کەس وەڵامی نەدایەوە . ( ئاواز خان ) ڕووی دەمی کردە ( نەوزاد ) و پێی‌وت :

— ( نەوزاد ) تۆ سەرۆکی پۆلی . ئەبێ بزانی کێ‌یە ئەو وێنەیەی کێشاوە .

— نازانم کێ کێشاویە . کە من هاتم کێشرابوو .

— سەیرە ! ئەبێ هەر یەکێك هەبێ کێشابێتی .. دوێنێ تۆ ئاخر کەس بووی لە پۆل چوویتەدەر . دیوارەکە پاك‌و خاوێن بوو .

کێ ئەمڕۆ یەکەم کەس بوو هاتە ژوورەوە ؟

کەس نەبوو بڵێ من یەکەم کەس بووم هـاتمە ژوورەوە . هەر یەکە سوێندی ئەخوارد ئەیوت کە من هاتم پۆلەکە پڕ بوو لە قوتابی .

( کوردە ) ئەم هـەڵەی بە تاڵان زانی .. تا ئـەوان لە گفتوگۆکەیان بوونەوە دەرزەکەی لەسەر دەفتەرەکەی من نووسی‌یەوەو دڵۆپێکیش مەرەکەبی پیا ڕژاندو دایمیەوە .

— ئـەوە چی‌یە ؟ من دەفتـەرم بە خـاوێنی دایتێو تۆ بە مەرەکەباوی داتمەوە .

— بەخوا بە دەسەنقەستوام لێ نەکرد .

— بە دەسەنقەست وات لێ کردبێ یا نە ، من هـەقم چی‌یە . ئەم دڵۆپە مەرەکەبەم ناوێ ، ئەبێ لای‌بەی !

— تازە ناتوانم وەك خۆی لێ بکەمەوە . مەرەکەبەو پیا ڕژاوە . چۆنی لابەم ؟ بەڵام بەڵێن بێ جارێکی‌تر کە لێم‌وەرگرتی بە خاوێنی پێدەمەوە دەستت .

— چی چی ؟ جارێکی‌تر ؟

— جارێکی‌تر کە داوای دەفتەرەکەم لێ کردی .

— ناشێ بتەوێ هـەموو جـارێ دەرز لەسەر دەفتەرەکەی من بنووسیتەوە ؟

— هەموو جارێ نا ، جار جار .

لێرەدابوو ( ئاواز خـان ) بانگی ( کوردە ) ی کرد بێت بۆ سەر تەختـەکە پرسیارێك لەبارەی ئەو بۆیاخچی‌یەوە لێـك بداتەوە

که دیواری قوتابخانەکەی سپی‌کاری کرد . ( کوردە ) ئەبوو بیزانێ چەند پارە خەرج کراوە بۆ بۆیاخ کردنی ژوورەکان‌و هەیوان‌و دالانەکە . .

( کوردە ) ی بەدبەخت ! چۆن ئەتوانی لەسەر تەختەوە وەڵامی پرسیار لەبەر دەفتەری برادەرەکانت بنووسیتەوە ! بەڵام ( کوردە ) بە زیرەکی‌ی خۆی ، خۆی دەرباز کرد . ئەمە بەڕاستی سەرسامی کردم . دەمێکی زۆری پێچوو ، هەموو دەرزەکەی گرتەوە ، چونکە پرسیارەکە درێژو ناڕەحەت بوو .

دیاربوو ( ئاواز خان ) ئەم پرسیارەی بەتایبەتی پێدا‌ین . مەسەلەی ئەم دەریاوانە ، هەروا بەئاسانی ، نابڕێتەوە . لە دوا سەعاتی خوێندنا دیمان . مامۆستا ( سەربەست ) ی بەڕێوەبەری قوتابخانە هاتە ژوورەوە . مامۆستا ( سەربەست ) هەرگیز خۆی مۆن پیشان نەداوە ، سەرو سیمایەکی هێمن‌و دەنگێکی ئارامی هەیە . تەنها لەوەی ئەترسم کە زۆر زلە . لە زلیدا لە باوکم ئەچێ‌و بەڵکو کەمێکیش لەو زلترە . چاکەتێکی دەڵێی لەبەردایە ، سێ قۆپچەی پێوەیە . جووتێ چاویلکەشی ناوە بەسەر لووتیەوە .

وام ئەزانی دەس ئەکا بە قڕە ـ قڕ بەسەرماندا . بەڵام بە بێ ئەوەی خۆی تووڕە بکا بۆی باس‌کردین کەوا میری چەند پارە خەرج ئەکا بۆ پێ‌خوێندنی هەر قوتابی‌یەک‌و ، کە پێویستە بە باشی فێر ببین‌و ئاگامان لە شتومەکی قوتابخانەو لە قوتابخانەکە خۆیشی بێ . هەروەها پێی‌وتین ئەوەی شتومەکی قوتابخانە بفەوتێنێ‌و دیوارەکەی ناشیرین بکا خراپە لەگەڵ گەل ئەکا ، چونکە گەل پارە بۆ قوتابخانەکان خەرج ئەکا . لەدواییدا وتی :

- بێ گومانم لەوە کەوا ئەوەی ئەم وێنەیەی لەسەر دیوارەکە کێشاوە نەیویستووە خراپە لەگەڵ قوتابخانە بکاو ، ئەگەر بێتو خۆی لەخۆیەوە پێی لێ بنێ ئیسپاتی ئەکا کە پیاوێکی مەردەو بە نیازێکی خراپ ئەوەی نەکردووە .

بەڕاستی قسەکانی کاریگەر بوون لە دڵمدا ، وامئەزانی ( ئارام ) ڕائەپەڕێو ئەڵێ من بووم وێنەکەم کێشا . بەڵام وادیاربوو نەیئەویست ئیسـپاتی بکا کە پیاوێکی مەردەو لە جێی خۆیدا نەبزووت . لەوکاتەدا مامۆستا ( سەربەست ) وتی :

— ڕەنگ بێ ئەوەی وێنەکەی کێشاوە ڕووی نەیەت خۆی دەرخا . با بیر لە کردەوەکەی خۆی بکاتەوەو ، ئازا بێ پاشان بڕوا بۆ ژووری بەڕێوەبەرو چاوی پێ بکەوێ .

کە لە دەرزەکە بووینەوە ( ئاشتی ) ی سەرۆکی تیپی پێشەنگە وردیلەکانی پۆلەکەمان چوو بەلای ( ئارام ) ەوە پێیوت :

— کەواتە تۆ بووی ! ئەوە کێ پێیوتی دیوارەکە وا ناشیرین بکەی ؟ تۆ ئەزانی چیت کردووە ؟

— ( ئارام ) بە نارەحەتییەکەوە هەڵسایە سەر پێو وتی

— چوزانم !

— ئەو وێنەیەت بۆ کێشا ؟

— نازانم ! لە خۆمەوە عەقڵم گرتیو بێئەوەی بیری لێ بکەمەوە کێشام .

— بێئەوەی بیری لێ بکەیتەوە ؟ بەڵام شەرەفی هەموو پۆلەکە

بەهۆی تۆوە شکا ..

— شەرەفی هەموو پۆلەکە بۆ ؟

— چونکە مامۆستاکان دڵیان لە هەرکام لە قوتابییەکان پیسە .

— جا بەڵکو قوتابییەك لە پۆلێکیترەوە هاتبێ کێشابێتی !

— جارێکیتر نەکەی شتیوا بکەی !

—- هاوڕێیینە ! گفت بێ ، گفتی پیاوی مەرد ، جارێکیتر ، شتیوا نەکەم ! بە بێ بیر لێکردنەوە کێشام .. ئەمویست بزانم ..

تەختەسڕەکەی هەڵگرت وێنەکەی بێ بسڕێتەوە ، بەڵام دیوارەکەی ناشیرینتر کرد . . ئەوسا وێنەی دەریاوانێك بوو ، ئیستا بوو بە پەڵەیەکی ڕەش بە دیوارەکەوە . تەختەسڕەکەم لە دەستی سەند تا ئەوەندەیتر پەڵەکە گەورە نەکا ..

کە لە قوتابخانە دەرچووین دیسانەوە چووینەوە بۆ فتبۆڵێنو تا ئێوارە یاریمان کرد . کە گەڕاینەوە ( کوردە ) منی لەگەڵ خۆی برد بۆ ماڵی خۆیان . ماڵی ئەوانیش هەر لەسەر ئەو شەقامەیە کە ماڵی خۆمانی لەسەرە . ماڵەکەیان ماڵێکی لە تەختە دروستکراوی دووقاتە ، نزیکە لە ماڵی خۆمانەوە . ماڵەکانی شەقامەکەی ئێمە هەموو ماڵی گەورە گەورەن چوار قاتو پێنج قاتن . پێشان لە دڵی خۆما هەر لێکم ئەدایەوە ئاخۆ ئەبێ ئەم ماڵە لە تەختە دروست کراوە بچووکە ماڵی کێ بێ ؟ ئەمئەزانی ماڵی کێیە . وا ئیستا بۆم دەرکەوت ماڵی ( کوردە ) یە .

ئەمئەویست بچمە ژوورەوە ، چونکە درەنگ بوو . بەڵام ( کوردە )

زۆری لێکردم . وتی :

— خۆت ئەزانی ئیستا دایکمو ئەوان دێن بەسەرما ، چونکە لەمێژە خەریکی یاری کردنمو درەنگم پێچووەو ، ئەگەر تۆم لەگەل بێ کەمێك بارم سووك ئەکەی .

— بەخوا منیش کە بچمەوە هەندێکم پێ ئەکەن !

— کەواتە ئیستا ئەچینە مالی ئێمەو پاشانیش پێکەوە ئەچین بۆ مالی ئێوە .

— زۆر چاکە !

چووینە ژوورەوەو بە پلەکانە دارینەکەدا سەرکەوتینە سەرەوە . لەژێر پێمانا جیرەی ئەهات . مەحەجەرەیەکی شکاوی هەبوو . ( کوردە ) تەقەی‌دا لە دەرگایەك موشەمایەکی رەشی پێوەبوو .

دایکی بە دەم کردنەوەی دەرگاکەوە ، وتی :

— ( کوردە ) ئەوە تۆی ؟ ئەوە تائیستا لەکوێ خەریکی کەرالی بووی ؟

— دایە ! ئا ، خۆممو ( شاهۆ ) ی هاوڕێولیشم لەگەلە هێناومە بۆ لات . . لە قوتابخانەدا پێکەوە لەسەر یەك تەختە دائەنیشین . .

شێوەی قسەی دایکی کەمێك هێمن بووەوە :

— وەرنە ژوورەوە . . وەرن !

چووینە ناو دالانەکە .

— ئای هاوار خوا ! ئەرێ هەتیوینە ئەوە لەکوێ یاریتان

کردووە .. تا سەیرێکی دەمو چاوی خۆتان بکەن !.

سەیرێکی ( کوردە ) م کرد ، ئەبینم دەمو چاوی سوور هەڵگەڕاوەو ، تەوێڵو گۆنای پیس بووە . سەری لووتیشی ڕەش بووبوو . حاڵی منیش لە حاڵی ئەو باشتر نەبوو ، چونکە قتبۆڵەکە دابووی بە ناوچاوما . ( کوردە ) ئەنیشکێکی تێوە ژەندم .

— زووکە با بڕۆین دەمو چاومان بشۆین ، ئەگینا ئەگەر ئاوا بڕۆیتەوە ماڵ دایکت هەندێکت پێ ئەکا ..

چووینە ژوورەوە ، لەوێیش پێشکەشی پووری کردم :

— پوورە ( زارا ) ! ئەمە ( شاهۆ ) ی هاوڕێمە ، لە یەك پۆل‌داین .

پوورە ( زارا ) ی لە هەڕەتی لاوی‌دایە ، هەتاوەکو پێشان وام‌زانی خوشکی گەورەیەتی . بە پێکەنینێکەوە سەیرێکی کردم ، چونکە ئەوەندە پیس بووبووم هەرکەس بیدیمایە پێکەنینی پێم ئەهات . ( کوردە ) دەستێکی ژەندە کەلەکەم . چووین بۆ سەرەشۆرگەکەو دەسمان‌کرد بە داشتنی سەرو چاومان .

کە دەمو چاومان ئەشۆری ( کوردە ) لێی‌پرسیم :

— کیان‌لەبەرت خۆش‌ئەوێ ؟

— ئەمە لەسەر جۆری کیان لەبەرەکە وەستاوە . پلنگو نەهەنگو شتی‌وام خۆش‌ناوێ چونکە گاز ئەگرن .

— من باسی ئەم جۆرە کیان‌لەبەرانەت بۆ ناکەم . مشکت خۆش ئەوێ ؟

— مشکم خۆش ناوێ . کەل‌وپەل لە کەڵك ئەخاو هەرچی بەرچنێك کەوێ ئەیخوا . .

— مشك هیچ ناخوا . . تۆ ئەڵێی چی ؟

— چۆن هیچ ناخوا ؟ جارێکیان کتێبێکم لەسەر ڕەفە دانابوو مشك خواردی .

— ئەوە چونکە هیچت نەداوەتێ بیخوا ، بۆیە کتێبەکەی خواردووی !

— هیچ نەماوە بیکەم ئەوە نەبێ خۆراك بە مشك بدەم !

— ئەی چۆن ! ئەبێ خۆراکی بدەیتێ . من هەموو ڕۆژێ خۆراکی ئەدەمێ‌و خانووە قۆڵەیەکیشم بۆ کردووەتەوە .

ـ تۆ شێتی . . کێ خانوو بۆ مشك ئەکاتەوە ؟

ـ مشکیش ئەبێ شوێنێکی بێ تیا بژی . ئێستا ئەو خانووەت پیشان ئەدەم کە بۆ مشکەکانمم کردووەتەوە .

لە دەم‌و چاو شتن بووینەوەو چووینە چێشت‌خانەکە . لەژێر دەس شۆرەکەدا قوتووە شقارتەیەکی زۆر نووسێنرابوون بەیەکەوەو خانووە قۆڵەیەکیان لێ دروست‌کرابوو ، چەند دەرگاو پەنجەرەی لەسەر بوو . گیانلەبەری بچکۆلەی سپی‌یان لێ ئەهاتە دەرەوەو بازیان ئەدایە سەربانی خانووە قۆڵەکەو ئەگەڕانەوە ژوورەوە . خانووە قۆڵەکە کلاو ڕۆژنەیەکی تیابوو گیانلەبەرێکی بچووکی سپی لەو کلاو ڕۆژنەیەوە ئەی‌ڕوانی . حەپەسام .

پرسیم :

ـ ئەو گیانلەبەرانە چین ؟

— چۆن چین ؟ مشکن !

— بەلام مشك ڕەنگی خاکی‌یەو ئەمانە سپین ؟

— ئەمانە مشکی سپین . بۆچی مشکی سپیت هەرگیز نەدیوە ؟

( کوردە ) دەسی‌برد یەکێکیانی گرتو دای بەدەستمەوە بیگرم . ئەتوت شیرە ئەوەندە سپی بوو . کلکێکی درێژی زەردباوی هەبوو ئەتوت تووکەکەت ڕووتاندووەتەوە . بەسەر دەستمەوە بێدەنگ ماتەی کرد ، تەنها لووتی ئەجوولاندەوە ، وەك بڵێی بی‌یەوێ بزانێ ئاسمان بۆنی چی لێ دێ . جووتێ چاوی سووری پێوەبوو ئەتوت دەنکی یاقووتن .

— ماڵی ئێمە مشکی سپی‌ی تیا نی‌یە . مشکەکانمان هەموو مشکی خاکین .

— ( کوردە ) دایە قاقای پێکەنین :

- خۆ من ئەم مشکانەم لە ماڵا نەگرتووە . کڕیومن . لە کۆگای کیانلەبەران دوو جووتم کڕی . ئێستا سەیرکە چەندیان لێ کەوتووەتەوە . ئەگەر ئەتەوێ جووتێکیانت ئەدەمێ ..

— چی ئەخۆن ؟

— هەموو شتێ ئەخۆن . ئەتوانی نان ، ساوەر ، شیریان بدەیتێ . وتم باشە ، جووتێکیانم بدەرێ .

( کوردە ) چوو کەڕا ، قوتوویەکی مەقەبای دۆزی‌یەوە ، جووتێ مشکی تێ‌خستو خستیە گیرفانی ..

— خوم هەڵیان ئەگرم ..

— نە ، خۆم بۆتیان هەڵ‌ئەگرم . تۆ شارەزایان نەبوویی ،

ئەوەك بی‌یان پلیشێنێتەوە .

هەردوکمان چاکەتمان لەبەرکرد بچین بۆ ماڵی ئێمە .

دایکی ( کوردە ) پرسی :

ـ ئەبجار بۆ کوێ ؟

ـ هار ئێستا ئەگەڕێمەوە . گفتم بە شاهۆ داوە تا ماڵی خۆیان ئەگەڵی بڕۆم . لە یەك دەقیقە زیاترم پی‌ناچێ !

دەقیقەیەکی نەبرد گەیشتینە ماڵی ئێمە . کە دایکم دیمی بە تەنها نیم بەسەرما نەهات . منیش بۆم باس‌کرد کەوا :

ـ ئەمە ( کوردە ) ی هاوپۆلمە .

دایکم ڕووی‌کردە ( کوردە ) و بەخێرهاتنی لێ کردو لێی پرسی :

ـ ( کوردە ) ، تازەی ؟

ـ بەڵێ ، پووری ، ئەمساڵ هاتوومەتە ئەم قوتابخانەیە .

ـ ئەی پێشان لەکوێ بووی ؟

ـ لە ( نالچیك ) بووم . ماڵمان لەوێ بوو . باجیم پۆلی دەیەمی تەواو کرد . ئەیویست بچێتە خوێندنگای هونەری شانۆ ، ئەو خوێندنگایەش لەوێ نەبوو . بارمان کرد هاتین بۆ ئێرە .

ـ ئێرەت پێ خۆشترە یا ( نالچیك ) ؟

ـ ( نالچیك ) م لا خۆشترە ، بەڵام ئێرەش خۆشە . ( کراسنە ژەڤۆدسك ) یشم هەر پێ خۆشە . پێش ( نالچیك ) یش ماڵمان لەوێ بوو .

ـ ئەگەر هەموو شـوێنێکت پێ خۆش بێ ئەوە نیشانەی ئەوەیە تەبیعەتت زۆر باشە .

ـ نەوەڵڵا تەبیعەتم زۆر خراپە . دایکیشم پێم ئەڵێ هیچت لە دەست نایەتو نابی بە هیچ ..

ـ بۆچی وات پێ ئەڵێ ؟

ـ چونکە ئیشەکانی قوتابخانەم لەکاتی خۆیاندا جێبەجێ ناکەم .

ـ دیارە تۆش وەك ( شاەۆ ) ی ئێمە وایت . ئەویش ئیشەکانی قوتابخانەی لەکاتی خۆیاندا جێبەجێ ناکات . ڕۆڵە ، هەوڵ بدەن .. تۆزێ ڕەوشتی خۆتان چاك بکەن !

لەمکاتەدا بوو ( لاولاو ) ی خوشکم کردی بە ژوورا .

( کوردە ) بە ( لاولاو ) ی وت :

ـ مەرحەبا !

ـ مەرحەبا ، سەرچاو . بەخێربێی !

( لاولاو ) وەڵامی دایەوەو وەك وابزانێ تابلۆیەکە لە پێشانگایەکدا دانراوە ، دەسی کرد بە سەیرکردنی .

( کوردە ) وتی :

ـ من تاقانەی دایکمم ، نە برام هەیەو نە خوشك ..

( لاولاو ) یش وتی :

ـ حەز ئەکەی خوشکت ببێ ، یا برا ؟

ـ حەز ئەکەم هەردوکیانم ببێ .. بووکڵەیان بۆ دروست بکەم ..

گیان لەبەریان بدەمێ .. خزمەتیان بکەم .. دایکم پێم ئەڵێ تۆ خزمەتی کەس ناکەیت ، بەڵام من کێم هەیە خزمەتی بکەم ؟!

ـ خزمەتی دایکت بکە .

ـ ناتوانم خزمەتی دایکم بکەم . دایکم هەموو سبەینێیەك ئەچێ بۆ ئیش . هەر چاوەڕوانیی ئەکەم .. چاوەڕوانیی ئەکەم .. تا ئێوارە ناگەڕێتەوە . جاریوا هەیە ئێوارەش ئەڕوا ..

ـ دایکت ئیشی چییە ؟

ـ شۆفێرە ، سواری ئۆتۆمۆبیلەکەی ئەبێ و ئەڕوا .

ـ زۆر چاکە .. کەواتە خزمەتی خۆت بکە . ئەو خزمەت کردنەی خۆت خزمەتە بە دایکیشت .

ـ وایە ، ئەزانم .

ـ ئەرێ ، ئەی چاکەتەکەت دۆزییەوە ؟

ـ کام چاکەت ؟ ئا .. ئا .. ئەرێ وەڵڵا دۆزیمەوە . هەر لەویا بوو کە لەبیرم چووبوو .

ـ بەم پێیە بڕۆی ئەمساڵ ڕەق ئەبیتەوە .

ـ بەچیدا وا ئەڵێی ؟ بۆچی ڕەق ئەبمەوە ؟

ـ تۆ ڕۆژ نییە یا قاپووتەکەت یا شەپقەکەت لە شوێنێك لەبیر ئەچێ . دیارە ئەگەر هەر بەم جۆرە بی ئەم زستانە ڕەق ئەبیتەوە .

ـ من قاپووتم لەبیر ناچێ .. بەڵام ئەرێ تۆ مشکت ناوێ بتدەمێ ؟

(لاولاو) بە سەرسامییەکەوە وەڵامی دایەوە :

ـ م .. م .. م .. م .. مشك ؟ وی !

- ناتەوێ جووتێ مشکت بدەمێ ؟
- لاچۆ ، لا .. مشکم بۆ چی‌یە ؟
- زۆر جوانن !
ئەمەی وت‌و دەستی‌برد قوتووەکەی لە گیرفانی دەرهێناو پێشانی (لاولاو) ی دا . (لاولاو) هاواری لێ بەرز بووەوە :
- وی ! چەند جوانن !
ئەمە خستمیە دڵەکوتە . بانگم کرد ( کوردە ) :
- تێم‌گەیەنە ، وادیارە ئەتەوێ مشکەکانی من بدەی بە (لاولاو) ؟ ئەی تۆ ئێستا نەتدان بە من ، وا ئەتەوێ گورج لێمیان بسێنیتەوەو بی‌یاندەی بەو ؟
— مەترسە ، مە ! هەر ئەمەوێ پێشانی بدەم . مشکی‌تر ئەدەم بەو . هی‌تریشم هەیە . مەگەر تۆ خۆت بتەوێ هێنەکانی تۆ بدەم بەوو هی‌تر بۆ تۆ بێنم .
(لاولاو) خۆی تووڕە کردو وتی :
— نە ، نابێ . ئەمانە بۆ ( شاهو ) .
— باشە ، سبەینێ هی‌تر بۆ تۆ دێنم . تۆ ئێستا هەر ئەوەندەت بەسە کە سەیریان بکەی .
( لاولاو ) دەستی برد بۆ مشکەکان .
- وی ! خۆ گازیش ناگرن ؟ ..
- ئەمانە مشکی هێدین ، گاز ناگرن !
( کوردە ) هەستا لێ‌ی‌دا ڕۆیی‌و ، من‌و (لاولاو) یش پاکەتێکی پاقلاوەمان هێناو دەرگاو پەنجەرەمان تێ‌خست‌و تیامان دانان . لە کونەکانەوە زرتەی چاویان ئەهات . بەڕاستی مشکی جوان بوون ..

ئەمڕۆش درەنگ دەستم بە ئیشەکانی قوتابخانەم کرد . بە عادەتەکەی خۆم لە ئیشە ئاسانەکانەوە پیا هاتمو پرسیارەکەم خستە دواوە . بەڕاستی پرسیارێکی گرانە . ناچار دەفتەرەکەم هەڵگرتو لەگەڵ کتێبەکانا خستمە جانتاکەم ، بەڵکو سبەینێ لەبەر دەفتەری یەکێ لە ئاوەڵەکانم بینووسمەوە . ئەگەر ئێستا خۆم هەوڵ بدەم بزانم دایکم دێتەوە بەسەرما بۆچی ئیشەکانم دواخستووە بۆ ئێستە ، یان باوکم دەس ئەکاتەوە بە لێکدانەوەی بۆمو ئیشەکەی خۆی لێ تێکئەچێ . باشتر ئەوەیە وێنەی مەکینە سافکەرەکەی خۆی بکێشێ یا بیر لە نموونەکانی خۆی بکاتەوە .



کاتێ گە من بە ئیشەکانی خۆمەوە خـــەریك بووم، ( لاولاو ) خەریك بوو لۆکەو پووشی ئەخستە ناو مالەقۆلەی مشکەکانەوە بۆئەوەی جێگەکەیان گەرمو نەرم بێو ساوەرو نانی ئەدانێو قاپێکی بچکۆلەی بۆ دانابوون شیری بۆ تێکردبوون • گە لە کونەکانەوە ســەیرمان ئەکردن ئەماندی خەریکی ســاوەر کرتاندنن • هەر تاو نەو تاوێ یەکێکیان لەسەر دوو پێ ئەوەستاو بە دوو دەس دەمو لووتی خۆی ئەسرییەوە • بەراستی شتێکی سەیر بوو، ئەوەی چـــاوی لێبوایە خۆی پێ رانەئەگیرا ، دەســـــتی ئەکرد بە پێکەنین • ( لاولاو ) بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەبەر مالەقۆلەی مشـکەکانا راوەستابوو ، لە کونەکانەوە سەیری ئەکردنو پێئەکەنی .

منیش هەلسامەوە چووم بۆ سەیرکردنیان . (لاولاو ) پێیوتم :

- ئەم کورەی برادەرت کورێکی چەند چاکە ؟

- کێ ؟ ( کوردە ) ؟

- ئا . ( کوردە )

- چاکییەکەی چییە ؟

- کورێکی بەئەدەبەو قسەی باش ئەکا . هەتاوەکو قسەی لەگەل منیش کرد .

- بۆ ئەبێ قسە لەگەل تۆ نەکا ؟

- چونکە من کچم !

- بۆ کچ چییە ؟ کچ قسەی لەگەل ناکرێ ؟

- کوا ؟ کوران قسە لەگەل کچ ناکەن . خۆیان لێ بایی بووە؟ ئەبێ ( کوردە ) بکەی بە برادەری خۆت .

- حەزم ئەکرد بۆ (لاولاو) ی بگێرمەوە کە وەنەبێ ( کوردە )

کوڕێکی ئەوەندە چاك بێ . دەرزەکانی لەبەر دەفتەری قوتابی‌یەکانی‌تر ئەنووسیێتەوە ، هەتاوەکو جارێکیشـــیان کە دەفتەرەکەی دامەوە داوێنیکی گەورە مەرەکەبی پیا ڕشتبوو . بەڵام پێم نەوت . هەر ئەوەندەم پێ وت کە :

ـ ئەزانم کوڕی چاکە .. هـــاوڕێکانم هەموو کوڕی چاکن .. قوتابی یەکانی پۆلەکەم هەموو کوڕی چاکن !..

# بەشی چوارەم

سێ چوار ڕۆژی بەسەرا تێپەڕی . لەیادم نەماوە ، ڕەنگە بێ پێنج ڕۆژیشی بەسەرا تێپەڕیبێ . ڕۆژێکیان ( سوارە ) ی سەرنووسەرانی ڕۆژنامە دیواری‌یەکەی قوتابخانە لەناو پۆلا بە (ئاواز خان ) ی وت :

- دەستەی نووسەران کەسیان تیا نی‌یە بزانێ وێنە بکێشێ . پار ( میدیا ) هەبوو هەموو وێنەکانی ئەکێشا ، بەڵام ئەمساڵ کەس شك نابەین . پێویستە وێنەکێشێك بۆ ڕۆژنامەکەمان دابنێین .

- ڕاستە ، ئەبێ وێنەکێشێکی بۆ دابنێین ، وێنە باش بکێشێ . سبەینێ یەکێك دیاری ئەکەین . با سبەینێ قوتابی‌یەکان هەرچی وێنەیان کێشاوە لەگەڵ خۆیانی بێنن . جا هەرکامیان دەرکەوت لەوانی‌تریان باشترە ئەوەیان ئەکەین بە وێنەکێشی ڕۆژنامە .

- ئەی ئەوانەی کە وێنەی دانراویان نی‌یە ؟

- با وێنەی تازە بکێشن . هیچ نەبێ یەکی وێنەیەك بکێشن . زەحمەت نی‌یە ،

- هەموو بە یەك دەنگ وتیان :

- باشە !

بۆ سبەینێ هەموویان وێنەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا . هەندێکیان وێنەی کۆنیان هێنابو و هەندێکیان وێنەی تازەیان کێشابوو . کۆمەڵێکیشیان یەکی بن‌دەستێك وێنەیان هێنابوو . (ئارام)یش

ئەلبوومێکی پڕی هێنابوو . منیش هەروەها کۆمەڵێك وێنەم هەبوو .
هەرکامان وێنەکانی خۆی لەسەر پێشی تەختەی دانیشتنەکەیا دانا .
( ئاواز خان ) بە ناومانا گەڕا بۆ سەیری وێنەکان . ئاخری لە
( ئارام ) نزیك بووەوەو ئەلبوومەکەی ئەوی پەڕە پەڕە کرد .
ئەلبوومەکەی (ئارام ) پڕ بوو لە وێنەی دەریاو پاپۆڕو کەشتی و شتی وا .

( ئاواز خان ) وتی : (ئارام) باشترین وێنەکێشێکە . ئەم ئەکەین
بە وێنەکێشی ڕۆژنامەکەمان .

( ئارام ) زەردەخەنەیەك کرتی . زۆری پی خۆش بوو کە (ئاواز
خان ) وای وت . هەر لەوکاتەدا ( ئاواز خان ) پەڕەیەکی تری لە
ئەلبوومەکەی ( ئارام ) هەڵدایەوە ، وێنەی دەریاوانێکی بەرچاو کەوت
کراسێکی خەتخەتی لەبەرابوو ، قلیانێکی نابوو بە دەمیەوە ،
کوتومت لەو دەریاوانە ئەچوو کە وێنەی لەسەر دیوارەکەی
قوتابخانە کێشرابوو . ڕووی گرژ کردو چاوێکی بڕییە ( ئارام ) .
( ئارام ) پەشۆکاو خۆی هیچ پێ ڕانەگیرا ، پێی لێنا کە ئەو بووە
وێنەکەی لەسەر دیوارەکە کێشاوە :

— من بووم وێنەی دەریاوانەکەم لەسەر دیوارەکە کرد .

— دیارە تۆ بووی . بەڵام کە ئەو ڕۆژە پرسیم کێ کێشاویەتی
بۆچی دەنگت نەکرد ؟ کارەکەت کارێکی باش نەبوو . بۆچی
وات کرد ؟

— خۆیشم نازانم بۆچی ؟ هەر بە ڕێکەوت وام کرد ،
بێ ئەوەی هیچ بیری لێ بکەمەوە .

— هەر باشە ئیستاش پێت لێناو خۆت دەرخست . کە لە
دەرز بووینەوە برۆ بۆ لای بەڕێوەبەرو داوای لێبووردنی لێ بکە .

( ئارام ) پاش دەرز چووە لای بەڕێوەبەرو داوای چاوپۆشی ی لێ کرد .

مامۆستا ( زێوەر ) یش پێی وت :

— میری هەموو ساڵێ پارەیەکی زۆر بۆ تازە کردنەوەو ئاوەدان کردنەوەی قوتابخانەکان خەرج ئەکات . تازە ئیستا ناتوانین دیوارەکە پاك کەینەوە . بڕۆرەوە بۆ ماڵو پاش قاوەڵتی وەرەوە .

پاش قاوەڵتی ( ئارام ) گەڕایەوە بۆ قوتابخانە . سەتڵێكو هەندێك بۆیەو فڵچەیەکیان دایە دەست . دیوارەکەی سپی کردەوەو دەریاوانەکە بە دیوارەکەوە نەما .

وامان ئەزانی ( ئاواز خان ) نایەڵێ ( ئارام ) ببێ بە وێنەکێشی ڕۆژنامەکە ، کەچی پێی وت :

— ئەوە باشترە لە ڕۆژنامەکەدا وێنە بکێشێ تا لەسەر دیواری قوتابخانەکە .

هەڵمان بژاردو کردمان بە وێنەکێشی ڕۆژنامە . قوتابییەکان هەموو ئەمەیان پێ خۆش بوو . هەروەها منیش . بەڵام لەگەڵ ئەوەشا من نەئەبوو پێم خۆش بێ . ئەزانی بۆ ؟ چونکە :

منیش خووەکەی ( کوردە ) م گرتبوو . پرسیارەکانی قوتابخانەم لە ماڵەوە لێك نەئەدایەوە . هەڵم ئەگرت بۆ ڕۆژی دوایی کە دێمە قوتابخانە . لەوێ لەسەر دەفتەری یەکێ لە قوتابییەکان ئەمنووسییەوە . وام لێ هاتبوو وەك پێشینان وتوویانە : پێم بڵێ هاوڕێی کێیت ، پێت ئەڵێم خۆت کێیت ؟

لە دڵی خۆما وام لێك دابوەوە : بۆچی سەری خۆم بەم

پرسیارانەوە بپشێنم؟ خۆ هەرچی بکەم هیچی لێ حاڵی نابم . باشتر ئەوەیە لەبەر دەفتەری قوتابی‌یەکی‌تر بینووسمەوە . ئەمە ئاسانترەو ، زووتریش بۆم ئەکرێو کەسیش لە ماڵا لێم تووڕە نابێ .

تا ئەم دوایی‌یە هەر دەفتەرم لەو لەو ئەسەندو لەسەریم ئەنووسی‌یەوە . بەڵام کە ( ئاشق ) ی سەرۆکی تیپی پێشەنگە وردیلەکانمان پێی زانیم ، بەسەرما هاتو پێی‌وتم :

— ئەگەر هەر بەم‌جۆرە پرسیارەکانت لێك‌بدەیتەوە قەت فێری هیچ نابی‌و نابی بە هیچ .

— مەبەستم نی‌یە بزانم خۆم لێکیان بدەمەوە . من دانوولەم لەگەل ژمارە ناکوڵێو فێری نابم‌و ئیشیشم پێی نی‌یە .

نووسینەوە لەسەر دەفتەری قوتابی‌یەکی‌تر کارێکی ئاسانە . بەڵام کە لە پۆلا شتێکم لێ بپرسن مەگەر تەنها بەتەمای ئەوە بم ئاوەڵەکانم پێم‌بڵێن . بەختیشم یارە ، ئاوەڵەکانم پێم‌ئەڵێن . ( ئەوزاد ) یش لەوڕۆژەوە کە وتوویە نایەڵێ کەس هیچ بە کەسی‌تر بڵێ ، هەر هەوڵی ئەوەیەتی بتوانێ بڕیارەکەی خۆی بێنێتەدی . لەم دوایی‌یەدا کەوتە سەر فێڵەکەی : داوای لە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی قوتابخانە کرد وێنەیەکی کاریکاتۆریم بۆ بکێشن . بەیانی‌یەکیان کە هاتمە قوتابخانە سەیر ئەکەم وێنەیەکیان لە ڕۆژنامەی دیواردا کێشاوم . لەسەر تەختەکە وەستاوم خەریکی لێکدانەوەی پرسیارێکم ، جووتێ گوێچکەی درێژم پێوەیە بۆ لای تەختەی قوتابی‌یەکان کشاوە ، واتە تا ئەوەی کە ئاوەڵە قوتابی‌یەکانم پێمی‌ئەڵێن باشی ببیسم . لەژێر وێنەکەشدا ئەم چوار شیعرە ئابڕووبەرە نووسراوە :

( شاهۆ ) ی ئاوەڵمان ڕۆژ تا ئێوارە
هەر یاری ئەکاو بێ ئیش‌و کارە

کاتێك مامۆستا هەڵیئەستێنێ
وەڵام نازانێو دۆڕ دائەمێنێ
گوێچکە شل ئەکا بۆ هاورێکانی
تا فێری بکەن هەرچیی نەزانی
دیارە ئەم خووە هەر ئەیخەوتێنێ
ڕۆژێ لە ڕۆژان « دوان ( ١ ) » ی بۆ دێنێ

کە ئەوەمدی ئیمان لە کەللەما نەما . لە ڕقانا ڕەش داگیرسام . دەس بەجێ زانیم بێ‌و نەبێ ئەمە کاری ( ئارام )ە‌و ئەو ئەم وێنەیەی کێشاوە ، چونکە بەرلەوە کە ئەو بێتە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەوە وێنەی کاریکاتۆری‌ی تیا نەئەکێشرا .

چوومە گیانی پێم‌وت :

— تا زووە ئەو وێنەیە لە ڕۆژنامەکە ئەکەیتەوە باشە ، ئەگینا دوایی‌یەکەی باش نابێ !

بەرپەرچی دامەوە ، وتی :

— هەقی ئەوەت نی‌یە . من هونەرمەندێکم‌و بەس . داوایان لێ کردووم وێنەیەك بکێشم‌و کێشاومە . لابردنی بە دەست من نی‌یە .

— ئەی بە دەستی کێ‌یە ؟

— بە دەستی سەرەك نووسەرانە . ئەو بڕیاری هەموو شتێ ئەدا .

— چوومە سەر ( سوارە ) :

— ئەمە ئیشی تۆیە ؟ ئەی وێنەی خۆتت بۆ نەکێشا ؟

---

( ١ ) لە وڵاتی سۆڤیەتدا پلە لەسەر بناغەی نیشانەی تەواو دائەنرێ کە ئەکاتە ( پێنج ) . پلەکانی نیشانەش بەم‌جۆرەن : ( ٥ ) : زۆرچاك . ( ٤ ) : چاك . ( ٣ ) : خراپ نی‌یە . ( ٢ ) : خراپ . ( ١ ): زۆرخراپ .

— تۆ بۆ وائەزانی من خۆم ئارەزووم لە چی بێ ئەیکەم ؟
ئێمە دەستەی نووسەرانمان هەیە . ئەوان بڕیاری هەموو شتێك ئەدەن . ( ئەوزاد ) شیعرەکەی داناو داوای کرد وێنەیەکی کاریکاتۆریت بکێشرێو ، بەنیازی بەربەرەکانێ کردنی بەیەکەوتن لە ڕۆژنامە دیواری‌یەکەی قوتابخانەدا بڵاو بکرێتەوە . لە ئەنجومەنی تیپی وردیلە پێشەنگەکانا بڕیار دراوە کەس هیچ بە کەس نەڵێ !
دەس‌بەجێ چووم بۆ لای ( ئەوزاد ) پێم‌وت :
— کورج ئەو وێنەیە لابە ، ئەگینا ئەتکەم بە شاخە بەرخ !
حالی نەبوو ئەڵێم‌چی . لێی دووبارە کردمەوە :
— شاخە بەرخ ؟
— بەڵێ ، شاخە بەرخ ! وەك شاخی بەرخ ئەتشکێنم‌و ئەتهارم .
— واز لەم قسانە بێنە ! من لێت ناترسم .
— توخوا بەڕاستتە لێم ناترسی ؟ باشە ئەوا من خۆم ئەچم لای‌ئەبەم . جا بزانم تۆ چی ئەکەی ؟
— مادەم شتەکە ڕاستە ، هەقی ئەوەت نی‌یە بچی لای‌بەی . ڕاستیش نەبێ هەر هەقت نی‌یە . ئەتوانی پاکانە بکەیت .
— پاکانە بکەم ؟ هەر ئێستا پاکانە ئەکەم .
ڕادەرەکان هەموو چووبوون بۆ سەیری ڕۆژنامەکە . تەماشای وێنەکەیان ئەکردو پێ‌ئەکەنین . بەڵام من سوور بووم لەسەر ئەوە نەبەڵم مەسەلەکە تێپەڕێ . کورج دەسم‌کرد بە پاکانە نووسین . ئەوەی سەری لێ شێواندبووم ئەوەبوو نەم‌ئەزانی بنووسم چی ؟ چووم بۆ لای ( کامەران ) ی ئامۆژگاری‌کەرمانو باسەکەم لە سەرەتاوە بۆ گێڕایەوەو لێم‌پرسی کە ئەبێ بنووسم چی ؟ وتی :

— ئەكەمە فریات . بنووسە لەمەولا ڕەوشتی خۆم باش ئەكەمو لە جاران باشتر ئەخوێنمو لەمڕۆ بەدواوە پێویستم بەوە نابێ كەس هیچم پێ بڵێ . كە ئەمەت نووسی لە ڕۆژنامەدا بۆت بڵاو ئەكرێتەوەو منیش داوا ئەكەم وێنەكە لابەرن .

بە قسەكەی ئەوم كرد . وەك ئەو وتی وتارێكم نووسی ، گفتم تیا دا لەمەوپاش باش بخوێنمو پشت بە پێوتنی كەس نەبەستم .

بۆ سبەینێ وێنەكە بە ڕۆژنامەكەوە نەماو وتارەكەم لە شوێنێكی دیاریدا بڵاو كرایەوە . دڵم تەواو خۆش بوو . بەڕاستی‌یش ویستم لە جاران باشتر بخوێنم ، بەڵام كەمێك چاوەڕوانیم كرد . پاش چەند ڕۆژێك كە لە دەرزی ژمارەدا تاقی‌یان كردینەوە ، پلەی ( خراپ ) یان دامێ . وەنەبێ هەر من پلەی ( خراپ )م درابێتێ . ( سیروان ) یش هەر پلەی ( خراپ ) ی وەرگرت . ( ئاواز خان ) نیشانەكەمانی لە لیستەی پلەكانماندا نووسی‌و لیستەكەی دایە دەستمان ببەینەوە بۆ ماڵ تا باوك‌و دایكمان مۆری كەن .

گەڕانەوە بۆ ماڵ لەوڕۆژەدا شتێكی خۆش نەبوو . بەدرێژایی وەخت بیرم لەوە ئەكردەوە چۆن خۆم لەم پلەی ( خراپ )ە ڕزگار كەم . چی بكەم تا دایكم زۆر لێم تووڕە نەبێ .

لە ڕێدا ( كوردە ) پێی‌وتم :

— تۆش وەك ( مەریوان ) بكە .

— ( مەریوان ) كێ‌یە ؟

— قوتابی‌یەكە لە ( ئالچیك ) . هاوپۆلی من بوو .

— ئەو چی‌ی كرد ؟

— ئەویش پلەی ( خراپ ) ی درابوویە . چووەوە بۆ ماڵ‌و بێ ئەوەی ورتەی لە دەم دەربێ دانیشت‌و سەری داخست . هەركەس

بیدی‌بایە پێکەنیی پێ ئەهات . سەعاتێك بێ‌دەنگ بوو .. دوو سەعات بێ‌دەنگ بوو . هەڵیش‌نەستا بچێ بۆ یاری کردن . دوایی دایکی هاتە سەری لێی‌پرسی :

— « ئەرێ ئەوە ئەمڕۆ چیت لێ قەوماوە ؟ »

— « هیچم لێ نەقەوماوە »

— « ئەی بۆ وا دوژ داماوی‌و شەزت داخستووە ؟ »

— « هەروا ! »

— « چۆن هەروا ؟ ناشێ لە قوتابخانە شتێکت لێ قەومابێ ؟ »

— « نەوەڵڵا ! »

— « ئەی خۆ لەگەڵ کەسیش بە شەڕ نەهاتووی ؟ »

— « نەء »

— « شووشەی پەنجەرەی قوتابخانەکەشت نەشکاندووە ؟ »

— « نەء »

— « سەمەرە ، هەی سەمەرە ! »

کە چوویشە سەر مێزی نان خواردن دەءی لە هیچەوە نەدا .

— « بۆ ناخۆی ؟ »

— « دڵم نایا »

— « دڵت نایا ؟ »

— « نەء »

— « دە بڕۆ تۆزی بۆ خۆت پیاسە بکە ، بەڵکو ئەوسا دڵت بیگـــرێ »

— « ناڕۆم »

— « ئەی باشە چیت ئەوێ ؟ »

— « هیچم ناوێ »

— « نەخۆش نیت ؟ ڕەنگ بێ نەخۆش بیت »

— « نــەء »

دایکی دەستێکی بە ناوچاویا هێنــاو گەرمی پێوێکی هێنا خستیە ناودەمی . کە دەری‌هێنایەوەو تەماشای کرد ، وتی :

— « گەرمیش نیت . ئەی چیتــە ؟ شــێتت کردم ، تــۆقت پێ کردم ! »

« پلەی ( خراپ ) م وەرگرتووە لە دەرزی ژمارەدا »

— « هەی قوڕ بەسەر خۆما نەکەم ! ئەم هەموو کەر بازاڕەت هەر بۆ ئەوە بەرپا کرد کە پلەی (خراپ )ت وەرگرتووە لە دەرزی ژمــارەدا ؟ »

— « نا ، ئەی چۆن ؟ »

— « خەریکی دەرزەکانت بــە ، پلەی ( خراپ ) وەرناگری‌و نەبڕێتەوە . ئیتر ئەمەی بۆچی‌یە ؟ »

ئەمە هەموو قسەیەکی دایکی بوو کە لەگەلی کرد . خۆیشی هەر ئەوەی ئەویــست !

— جا ئەوا جارێك وا بردیەوە . بۆ جاری دووهەم دایکی کورج تێ ئەگا مەسەلە چی‌یەو ئەزانێ پلەی ( خراپ )ی وەرگرتووە . ئیتر ئەمجار چی ئەکا ؟

— بۆ جاری دووهەم شتێکی تازە ئەدۆزێتەوە ، وەك ئەوە دێتە لای دایکی‌و پێ‌ی‌ئەلێ :

— « دایە ، نازانی ( ڕەـــنا ) ی ناوەلم پلـــەی ( خراپ ) ی وەرگرتووە ؟ »

— « ئەی گیانی دەرچێ! باوك‌و دایکی ئەو هەموو ڕەنجە ئەدەن

بیکەن بە پیاو ، کەچی ئەو هەرگیز فێری هیچ نابێ‌و هەمیشە هەر پلەی ( خراپ ) وەرئەگرێ » .

بەمچەشنە دایکی هەندێ فەحش‌و فەزیحەت بە ( پەنا ) ئەکات . کە بێ‌دەنگ ئەبێ (پەنا) پێی‌ئەڵێ :

— « دایە ، ( ئومێد )یش هەر پلەی (خراپ)ی وەرگرتووە ..»

— « خوا ئەویش ڕاست نەکاتەوە چۆن قوتابی‌یەکە . مێری لە خۆڕایی ئەم هەموو پارەیەی بۆ خەرج ئەکات »

( مەریوان ) چاوەڕوانی ئەکات تا دایکی چی پێیە هەمووی هەڵئەڕێژێ .. ئەنجا تێ‌هەڵئەچێتەوەو ئەڵێ :

— « خۆ (فەرهاد)یش ئەمڕۆ هەر پلەی (خراپ)ی وەرگرت ! » .

دایکی ئەمجار هەندێکیش بەسەر (فەرهاد)دا دێت ، بەڵام لەوان کەمتر .. کە ( مەریوان ) ئەزانێ دایکی تاقەتی قسەکردنی نەماوە ، ئـــەڵێ :

ـ « ئەمڕۆ ڕۆژێکي شوومو تووش بوو بۆ قوتابخانەکەمان ، منیش هەروا پلەي ( خراپ )م وەرگرت .. »

دایکی هیچي بۆ نامێنێتەوە ئەوە نەبێ کە بلێ :

ـ داوەشێی ، خوێڕی ا.. و مەسەلەکە بەمجۆرە ئەبڕێتەوە .

ـ ئەزانی ، دیارە ئەم ( مەریوان )ی برادەرتە چوارپێ نەبوە؟

( کوردە ) یش دانی پیا نا کەوا :

ـ لەم جۆرە بابەتانەدا کـەر نەبوو . زۆر جار وائەبوو پلەی ( خراپ )ي وەرئەگرت ، بەڵام هەموو جـــارێ فێڵێکی بۆ خۆی ئەدۆزی‌یەوە تا تووش نەبێ .

هاتمەوە بۆ ماڵ . منیش بڕیارم دابوو وەك (مەریوان) بکەم . لەسەر کورسی‌یەك دانیشتم‌و سەرم داخست‌و ڕووی خۆمم گرژو مۆن

کرد ، تا وا دەرکەوێ خەفەتبارم . دایکم دیمی . کورج هات ، بە لامەوە لێی پرسیم :

ـ ئەوە چیتە ڕۆڵە ؟ ناشێ پلەی ( خراپ )ت وەرگرتبێ ؟

ـ با ا..

تێروپڕی پێ کردم !

گێڕانەوەی ئەمە وەنەبێ شتێکی خۆش بێ !



بۆ سبەینێ سەرە هاتە سەر ( کوردە ) و ئەویش لە دەرزی ڕێزمانا پلەی ( خراپ ) ی وەرگرت . کە گەڕایەوە ماڵ دایکی بەشی خۆی پەتپەتیی پێ کرد . بۆ ڕۆژی دوایی وێنەیەکی تری کاریکاتۆری‌ی لە ڕۆژنامە دیواری‌یەکەی قوتابخانەدا بڵاو کرایەوە . وێنەی منو ( کوردە ) بوو بە هەڵەداوان بەسەر جادەدا ڕامانئەکردو دوو نیشانەی (خراپ) یش یەکی بە جووتێ پێوە شوێنمان کەوتبوون .

تووڕە بووم .. چوومە سەر ( سوارە ) لێم‌پرسی :

— چی‌یە ئەمە ؟ کەی واز لەم ڕەوشتە ئەهێنن ؟

وەڵامی دامەوە :

— بۆچی بەسەرما ئەشیرێنی ؟ شتەکە ڕاستەو پلەی (خراپ)تان وەرگرتووە .

— بۆچی هەر ئێمەین پلەی ( خراپ ) مان وەرگرتووە ؟

( سـيروان ) يش پلەی ( خراپ ) ی وەرگرتووە . ئەی وێنەی ئەو بۆ ناکێشی ؟



— نازانم وێنەی ئەویان بۆ نەکێشاوە ! بە (ئارام)یان وت وێنـەی هەر سیانتان بکێشێ .

ئارام لەولاوە هاتە دەنگ ، وتی :

— ویستم وێنـەی هـەر سـیانتان بکێشم . بەڵام شوێنەکە جێی وێنـــەی هەمووتانی تیـــا نەبووەوە . لەبـەرئەوە وێنـەی دوانتانم کێشاو جارێکیتریش وێنەی ئەوتان ئەکێشم .

- هەمووی لای من چون یەکە . ناهێلم ئەمە هەروا بڕوا .

بە ( کوردە ) م وت :

— وەرە با پاکانەیەك بنووسین .

— چۆن ئەنووسرێ ؟

— ئاسانە . هەر ئەوەنـدەیە ئەنووسـین کەوا گفت ئەدەین لەمەوپاش باش بخوێنین . جاری پێشوو ( کامەران ) ئەمەی فێرکردم .

— باشە تۆ بینووسەو منیش لەبەر هینەکەی تو ئەی نووسمەوە .

دانیشتم دەســـمکرد بە نووسین کەوا گفت ئەدەم لەمەولا باش بخوێنم بۆئەوەی پلەی ( خراپ ) وەرنەگرم . ( کوردە ) یش

ئەو گفتەی من دابووم نووسی‌یەوەو ، سەرەڕای ئەوەش نووسی کەوا لەمەولا هەرگیز پلەی لە ( باش ) کەمتر نەبێ .

پێی‌وتم :

— ئەزانی ئەمە زۆرتر کار ئەکا ؟

وتارەکانمان دایە دەستی ( سوارە ) و پێم‌وت :

— بگرە ! ئەتوانی وێنەکانمان لابەری‌و وتارەکانمان بە شوێنێکی دیاریدا هەڵواسی .

— باشە !

سبەینێ کە چوومە قوتابخانە سەیر ئەکەم وێنەکەمان هەر بە شوێنەکەی خۆیەوەیەتی‌و وتارەکانیشمان هەڵنەواسراوە . بە هەڵەداوان چوومە لای ( سوارە ) لێم‌پرسی . لە وەڵاما پێی‌وتم :

— لە کۆبوونەوەی دەستەی نووسەراندا لە گفتەکەت کۆڵینەوە . بڕیار درا جارێ بڵاو نەکرێتەوە ، چونکە بەر لەمجارەش گفتت دا کە باشتر بخوێنی ، بەڵام گفتەکەت نەهێنایەدی‌و دیسانەوە پلەی ( خراپ ) ت وەرگرت .

وەڵامم دایەوە :

— باشە ، قەیدی نی‌یە . ئەگەر ناتانەوێ وتارەکەم بڵاوکەنەوە ، بڵاوی مەکەنەوە . بەڵام ئەبێ وێنەکە لابەرن !

وتی :

— بۆ ئەبێ لای‌بەرین ؟ ئەگەر تۆ وا تێبگەیت ئەتوانی هەموو ڕۆژێ گفتێك بدەیت‌و نەیشیهێنیتەدی ، دیارە بە هەڵەدا چوویت !

( کوردە ) خۆی پێ ڕاگیر نەکرا ، وتی :

— باشە ، ئەی وتارەکەی منتان بۆ بڵاو نەکردەوە ، خۆ من

بەر لە ئەمڕۆ گفتی هیچم نەداوە تا جێبەجێم نەکردبێ ؟
— لە ژمارەی داهاتوودا هێنەکەی تۆ بڵاو ئەکەینەوە .
— تا ئەوکاتە بە دیوارەوەم ئەهێڵنەوە ؟
— تا ئەوکاتە بە دیوارەوەت ئەهێڵینەوە !
— قەیدی نی یە ، بامەوابێ !
بەڵام من بڕیارم دا بەمە دەس بەردار نەبم . لە پشووی دواییدا چووم بۆ لای ( کامەران ) و هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە .
( کامەران ) پێ ی وتم :
— قسە لەگەڵ قوتابی یەکان ئەکەم و داوایان لێ ئەکەم ژمارەی داهاتوو زووتر دەرکەن و وتارەکانیشتان بڵاوکەنەوە . بەم نزیکانەش کۆ ئەبینەوە بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی پلە . وتارەکانی ئێوەش لەکاتی خۆیاندا گەیشتن .
— ئەی ناکرێ ئیستا وێنەکە لابرێ و وتارەکان بە جێگەکەیدا هەڵواسرین ؟
— ناکرێ !
— ئەی جاری پێشوو بۆ کرا ؟
— جاری پێشوو وایان ئەزانی ڕەوشتی خۆت چاك ئەکەیت ، لەبەرئەوە ئەوجارە شتێکی تایبەتی بوو . هەموو جارێ ناکرێ ڕۆژنامەکە سەقەت بکرێ ، چونکە هەموو ژمارەکانی هەڵ ئەگیرێن . لە دوارۆژا بنیادەم بەهۆی ئەم ڕۆژنامانەوە ئەتوانێ بزانێ وەختی خۆی پۆلەکە چۆنی ئیش کردووەو قوتابی یەکانی چۆنیان خوێندووە . لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان یەکێکتان ببێ بە پسپۆڕێکی بەناوبانگ یا کرێکارێکی زیرەك یا بە فڕۆکەوان یا بە زانایەکی بەرز .

کەسێك تەماشای ئەم ڕۆژنامانە بکا تێ ئەگا ئەو یەکە چۆنی خوێندووەو لەکاتی خوێندندا چۆن بووە ؟

ئەمەش ئەگبەتی یەکی تر ! من لەمێژە بڕیارمداوە کە گەورە بووم بم بە فڕۆکەوانێکی بەناوبانگ یا بکەومە جیهان گەردی .. لەوانەیە ئەوکاتە یەکێك ئەم ڕۆژنامە کۆن بووە ببینێ و ناوی منی تیا بەرچاو بکەوێ و بلێ : « هاوڕێ یینە ! ئەم بلیمەتە لەگەل ئەوەشدا لە منالیدا پلەی ( خراپ ) ی لە دەرزەکانی قوتابخانەیدا وەرئەگرت ! »

تا ماوەیەك ئەم خەیاڵە لە مێشکما هەر خولی ئەخواردو دلی نارەحەت ئەکردم . بڕیارمدا ئیتر لەمبارەیەوە هیچ بە ( کامەران ) نەڵێم .. پاشان وردە وردە دلم دامرکایەوە . لە دلی خۆما ئەموت : لەوانەیە بەرلەوەی من گەورە ببم ڕۆژنامەکە لەناوبچێ .. ئەگەر خوا بکا بفەوتێ شوورەییم نایەتەڕێ .

# بەشی پێنجەم



هەفتەیەکی خشت وێنە کاریکاتۆرییەکە بە دیوارەوە بوو . ژمارەی داهاتووی ڕۆژنامەکەش تا ئێوارەی پاش کۆبوونەوە گشتییەکە دەرنەچوو . ئەم ژمارەیە هیچ وێنەی کاریکاتۆریی تیا نەبوو ، وتارەکەی منو (کوردە) شی لە شوێنێکی دیاریدا تیا بڵاو کرابووەوە . دیارە گەلێ وتاریتریشی تیابوو ، بەڵام من لەیادم نەماوە ئەو وتارانە لە چی ئەدوان .

( کامەران ) داوای لێکردین خۆمان بۆ کۆبوونەوەو باس کردنی مەسەلەی پلەی قوتابیەکان ئامادە بکەین . لە پێشووی چوونە دەرەوەدا (یاوەر)ی سەرتیپمان کۆی کردینەوەو کەوتینە باس کردنی پلەکانمان . شتێکی گرنگمان بەدەستەوە نەبوو شایانی ئەوە بێ بووترێ . قوتابییەکان تێکرا وتیان ئەبوو منو (کوردە) هەر لە زووەوە پلە ( خراپ ) ەکەی خۆمان ڕاست کردایەتەوە . ئێمەش لەمڕووەوە هاودەنگ بووین لەگەڵیان ، کێ وائەزانێ پێمان خۆشە پلەی (خراپ) وەربگرین ؟

بۆ سبەینێ کۆبوونەوەیەکی گشتی بۆ پۆلەکە کرا .

( ئاواز خان ) ڕاپۆرتێکی لەو کۆبوونەوەیەدا لەبارەی پلەی قوتابی یەکانمانەوە دا . باسی ئەوەی کرد کـــە هەرکاممان چۆنی خوێندووەو ، ئەبێ قورسایی هەوڵو تەقەلای خۆی بخاتە سەر چی . وتیشی وەئەبێ تەنها ئەوانە کەوتینە گەرداوەوە کە پلەی (خراپ) یان وەرگرتووە . ئەوانەش کــە پلـــەی ( خراپ نی یە ) یان هێناوە هەر تووش بوون ، چونکە بنیادەم بەئاسانی لە ( خراپ نی یە )وە خل ئەبێتەوەو بەســەر (خراپ)دا ئەکەوێ . ( ئاواز خان ) ئەوەشی وت کە قوتابی یەکان تێکرا هێمن نەبوونو کردوویانە بە هەراو هەرکامیان شتێکی نەزانیبێ ئەوانی تریان پێیان وتووەو بۆیان ڕاست کردووەتەوە .

ئێمەش کەوتینە قسەکردن . هەرچەند ئەڵێم « ئێمەش » بەڵام لەڕاستیدا من بەدرێژایی ئەو کۆبوونەوەیە ورتەم لە دەم دەرنەهات ، چونکە پلەی ( خراپ )م وەرگرتبوو نەئەشیا خۆم بخەمە بەرچاو . . ئەبوو لەولاوە لە پەنایەکدا بۆ خۆم هەڵتووتێم .

یەکەم کەس کە قسەی کرد (نەوزاد) بوو . وتی هۆی ئەم هەموو پلـەی ( خراپ )و (خراپ نی یە) وەرگرتنە ئەوەتە قوتابی یەکان کە یەکێکیان شتێك نازانێ ئەوانی تریان گورج پێی ئەڵێن . ( نەوزاد ) لای وابوو ئەمە جۆرە نەخۆشـی یەکە کەوتووەتە ناو قوتابی یەکانەوەو ، وتی : ئەگەر قوتابی یەکان کەسـیان بەوانی تریان نەڵێن قوتابخانەکە ڕێك وپێك تر ئەبێ و ، قوتابی یەکان زۆرتر هـــــەوڵ ئەدەنو زیاتر پێش ئەکەون ، چونکە پشت بە هاوڕێکانیان نابەسـتنو بۆخۆیان بیر ئەکەنەوە . (نەوزاد) هەروەها وتی :

ـ من لە ئێستا بەدواوە بە هەڵە پیشانیان ئەدەم تـا ئیتر کەس پشت بە پێوتن نەبەستێ .

(جوامێر) نارەزایی خۆی لەم قسەیەی (نەوزاد) پیشان‌داو، وتی :
- ئەمە لەگەڵ گیانی هاورێیەتیدا یەك ناکەوێ !
- ئەی پێوتن لەگەڵ گیانی هاورێیەتیدا یەك ئەکەوێ ؟
- ئەویش لەگەڵیا یەك ناکەوێ . ئەبێ هەر هاورێیەکمان کە تێ نەگا ، یارمەتیی بدەین‌و تێی بگەیەنین . بەڵام پێوتن لە زیان بەولاوە هیچی پێ ناگەیەنێ .
- چەنـــد جار ئەمەمان وتووە ، کەچی دادی نەداوەو پێوتن نەبڕاوەتەوە ؟
- کەواتە ئەبێ ناوی ئەوانە بزڕێنین کە بەوانیتر ئەڵێن .
- چۆن ؟
- ناکرێ لە ڕۆژنامەی دیوارا باسیان بکەین ؟
(نەوزاد) هاواری کرد :
- شتێ چاکە ! هێرشێك ئەبەینە سەر پێوتن !

(یاوەر)ی سەرۆکی تاقمی ئێمەش وتی : تاقمەکەی ئێمە بڕیاریان داوە لەمەوپاش هەر بە خۆیان فێر ببن‌و هەرگیز پلەی (خراپ) وەرنەگرن . هەروەها قوتابییانی تاقمی یەکەم‌و دووهەمیش بڕیاریان داوە پلەی (باش)و (زۆر باش) نەبێ وەری نەگرن .



ئەنجا ( ئاواز خان ) دەســـی بە قسە کردو وتی : ئەبێ بزانن چۆن بەســەربردنی وەختی خۆتان ڕێك ئەخەن ، بۆئەوەی بتوانن باش بخوێنن . ئەبێ شەو زوو بنوونو سبەینێ زوو هەڵسن . ئەبێ سبەینان مەشقی وەرزش بکەنو پیاســەیەکی زۆر بکەن . نابێ هەر کە لە قوتابخانە گەڕانەوە دەس بـــەجێ بکەونە جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی قوتابخانەتان . پێویستە سەعاتێ ، ســەعاتو نیوێ بحەسێنەوە [ وەك من هـــەمـوو جارێ بە ( لاولاو )ی خوشـکـم ئەڵێم ! ] . ئـەبێ ئیشەکانتان بە ڕۆژا بکەن . زۆر شوورەیی یە ئیشەکانتان بخەنـە شەو ، چونکە بنیادەم مێشکی ماندووەو ئیشی بۆ ناکرێ . ئەبێ لە ئیشە گرانەکانەوە پیابێن تا ئەگەنە سەر ئیشە ئاسانەکان .

( سۆران ) لە ( ئاواز خان )ی پرسی :



— تێ گەیشتم کەوا ئەبێ پاش گـەڕانەوە لە قوتابخانە یەك دوو ســـەعات بحەسێینەوە ، بەڵام نازانم ئەبێ چۆن بحەسێینەوە ؟ من خۆم لەسەر کورسی پێ ڕاناگیرێ . ئەمەشم زۆر پێ ناخۆشە .

— حەسانەوە خۆ هەر ئەوە نی یـە لەسەر کورسـی دانیشیو باڵ شۆڕ کەیتەوە . ئەتوانی بچی بۆ ڕابواردنو یاری کردن ، یا هـــەر ئیشێ خۆت ئارەزووت لێ بێ بیکەی .

— ئەتوانین فتبۆڵین بکەین ؟

— بۆ ناتوانن؟ فتبۆڵین یاری یەکی زۆر چاکە . ماندوویەتی لە لەشی بنیـــادەما ناهێڵێ .

بەڵام پێویست بەوە ناکا پێتان بڵێمەوە نابێ بە درێژایی ڕۆژ هەر خەریکی یاری کردن بن . سەعاتێك یاری بکەن ، بە باشی ئەحەسێنەوەو پاشان ئەتوانن زۆر باش خەریکی دەرزەکانتان بن .
( کوردە ) وتی :
— زۆری نەماوە پەلە بدا . کە پەلەی دا ئیتر شوێن یاری یەکەمان ئەبێ بە قوڕ . نازانم ئەبێ ئەوسا لەکوێ یاری بکەین ؟
( کامەران ) وەڵامی دایەوە :
— قسەیدی نی یە . بەم نزیکانە هۆڵێکمان لەناو قوتابخانەدا بۆ چاك ئەکەن بۆ یاری کردنو ، بە زستانیش ئەتوانن باسکت بۆل بکەن ..
( کوردە ) بە سەرسامی یەکەوە وتی :
— شتی چاکە ! من ئەبم بە سەرۆك . بە سەری باوکم جاران سەرۆکی تیپی باسکت‌بۆل بووم !
( کامەران ) پێی‌وت :
— باشتر ئەوەیە خەریکی خوێندنی ڕێزمانەکەت بیت !
— نکوولیم نی یە . خەریکی ڕێزمانەکەشم ئەبم .
ئیتر کۆبوونەوەکە دوایی هات ..
کە قوتابی یەکان دەرچوونو تەنها تاقمەکەی ئێمە مانەوە ، ( کامەران ) پێی‌وتین :
— کوڕینە ! ئیشەکەتان باش جێ‌بەجێ نەکرد !
— چۆن ؟
— ئێوە کفتتان دا لەمەولا پلەی ( خراپ ) وەرنەگرن ، کەچی تاقمەکانی‌تر کفتیان دا لە ( چاك )و ( زۆر چاك ) بەولاوە وەرنەگرن !

( بەختیار ) وتی :

- ئێمە خۆ لەوان کەمتر نین . ئەوان بتوانن لە ( چاك ) کەمتر نەیەنن ، ئێمە بۆ ناتوانین ؟

( ئازاد ) وتی :

- قسەی تۆیە . خۆ ئەوان لە ئێمە زیرەکتر نین !

( جوامێر ) وتی :

- وەرن کوڕینـە ! با ئێمەش دەس پێ بکەین . من گفت ئـەدەم کەمتر لە ( چاك ) وەرنەگرم . خۆ ئێمە لە خوار کەسەوە نین !

ئەمە کاری کردە منیش . هاوارم کرد :

- ڕاســـتە ، تەواوە .. منیش گفت ئەدەم . تائێستا بەڕاستی دەستم بە ئیش نەکردووە . بەڵام وا ئێستا دەستم پێ کردو ئەیبینن . خۆتان ئەزانن لە ئیشا ئەوە حسێبە پیاو دەستی بداتێ ..

( کوردە ) وتی :

- ڕاستە ، ئەوە حسێبە پیاو دەست بداتە ئیش ، بەڵام بۆئەوەی لێ ببێتەوە ئەبێ سەری خۆت بشکێنی ..

( کامەران ) لێی پرسی :

- کەواتە تۆ ناتەوێ دەستی بدەیتێ ؟

- من گفت نادەم پلەی ( چاك ) وەربگرم . ئەتوانم بـۆ هەموو دەرزەکان گفت بدەم ، بۆ دەرزی ڕێزمان نەبێ . لە دەرزی ڕێزماندا گفتی لە ( خراپ نییە ) بەولاوە نادەم .

( یاوەر ) بە تووڕەیی یەوە وتی :

- چۆن ئاوێکمان بۆ ئەڕێژێ ؟ پۆلەکە هەموو گفتی داوەو ئـەو گفت نادا ؟ تۆ خۆت لە هەمووومان بە زیرەکتر ئەزانی ؟

- چۆن ئەتانەوێ گفت بدەم! من لە دەرزی ڕێزمانا هەرگیز لە (خراپ نیە) زیاترم وەرنەگرتووە . بەسمە ، ئەمەم بەسە !

(کامەران) لێی پرسی :

- (کوردە) ، تۆ بۆچی گفتی خۆت ئەشکێنی ؟ تۆ پێشان گفتت نەدا لەمەوپاش لە (چاك) کەمتر وەرنەگری ؟

- گفتم دا ؟ کەی گفتم دا ؟

(کامەران) دەسێکی بۆ ڕۆژنامە دیوارییەکە ڕاکێشاو پەنجەی نایە سەر وتارەکەی (کوردە)و لێی پرسی :

- ئەمە تۆ نەتنووسیوە ؟

- ئای ! ڕاست ئەکەی .. لەبیرم نەبوو !

- باشە ، لەسەر گفتەکەی خۆت ئەڕۆی ؟

- دیارە ، ئەی چارم چییە !

هەموو بە یەك دەنك هاوارمان کرد :

- هەر بژی (کوردە) ! ئافەرین (کوردە) ! نەتهێشت بکەوینە چاڵەوە . ئا وا بۆ پاراستنی شەرەفی پۆلەکەمان هەموو یەکمان گرت..

لەگەڵ ئەوەشدا (کوردە) دڵی خۆش نەبوو . کە گەڕایەوە بۆ ماڵ قسەی لەگەڵ نەکردم . خەفەتبار بوو ، چونکە من ئامۆژگاریم کردبوو ئەو وتارە بنووسێ ..

# بەشی شەشەم

نازانم ( کوردە ) چی‌ی بڕیار دا . بەڵام من دەستم کرد بە ئیش . بیرم کردەوە دیم ڕێکوپێکی لە هەموو شتێ گرنگترە . هەروەك ( ئاواز خان ) پێ‌ی‌وتم لە ئێستە بەدواوە ئێواران سەعات دە ئەخەومو بەیانیان زوو هەڵ‌ئەسم تا بە دەرزەکانما بچمەوە. کە لە قوتابخانەش گەڕامەوە سەعاتو نیوێك فتبۆڵێن ئەکەم ، تا کە دەستم کرد بە ئیش مێشکم هاتبێتەوە سەر خۆی .. کە ئێ‌یش‌بوومەوە ئیتر بە ئارەزووی خۆم ڕائەبوێرم ، یا ئەچم بۆ یاری‌کردن لەگەڵ ئاوەڵەکانم ، یا تا کاتی نووستن تەماشــای کتێب ئەکەم . لە دڵی خۆمدا ئاوام دانابوو ..

نیوەڕۆ کە لە قوتابخـانە گەڕامەوەو قاوەڵتیم کرد ، بەرلەوەی ئیشەکانم بکەم چووم بۆ فتبۆڵێن . بڕیارم وابوو لە سەعاتو نیوێ دوو سەعات زیاتر یاری نەکەم . بەڵام هەر کە گەیشتمە تەختانەکە جڵەوم بەدەست خۆمەوە نەما ، تا تاریکی نەکرد نەکــەوتەوە بیرم کە بڕیارم داوە زوو دەس هەڵگرمو بـگەڕێمەوە . پاش تاریـك داهاتن گــەڕامەوەو دەستم‌کرد بە ئیش . بـەڵام درەنگ بوو ، مێشکم لە کار کەوتبوو . بڕیارمدا سبەینێ زۆر یاری نەکەم ! کەچێ سبەینێ‌یش هەر هەمان دەستوور پاش خۆراوا بوون هاتمەوە. لە دڵی خۆما ئەموت : « یەك گۆڵی‌تر ئەکەین‌و ئەڕۆم ! » ، بەڵام نەم‌ئەزانی بۆ وا ئەکەم . کە گۆڵێکی‌تریشـمان ئەکرد دیسانەوە لە دڵی خۆما ئەموت « با گۆڵێکی‌تریش بکەین ئەوجــا ئەڕۆم » بەم‌جۆرە ڕۆژم گەیاندە ئێوارە ..

ئێواره بیرم له خۆم کردەوەو له دڵی خۆما وتم : « ڕاوەستە .. ئەوە تو چی ئەکەی ؟ وانابێ ! » . ورد بوومـەوە بزانم هی چی یە وا بڕیاری خۆمم بۆ نابرێتە سـەر . سـەرنجم‌دا ، دۆزیمەوە ، هی ئەوەیە کە عەزمم نی یە . عەزمم هـەیە ، بەڵام بەهێز نی یە . زۆر بێ‌هێزە . کە ئیشێکم ئەبێ پێویست بێ بیکەم ، نازانم چۆن خۆم ناچار بکەم بیکەم . کە نابێ ئیشێکیش بکەم ، نازانم چۆن خۆم ناچار بکەم کـە نەیکەم . کە دەس ئەکەم بە خوێندنەوەی کتێبێـکی خۆش ناتوانم دەستی لێ هەڵـگرم تا تەواوی ئەکەم ، هەرچەند ئەرکـەکانی قوتابخانەشـم جێ‌بەجێ نەکردبێ یا کاتی نووستنم دابێ . دایکم پێم ئەڵێ ڕۆڵە وەختی نووستنتە برۆ سـەر جێگەکـەت بنوو .. باوکم پێم ئەڵێ ڕۆڵە درەنگە برۆ بنوو .. کەچێ بەگوێی کەسیان ناکەم‌و هەر خەریکی خوێندنەوەکەی خۆم ئەبم .. ناچار ئەبن گوڵۆپەکـە ئەکوژێننەوە بۆئەوەی نەهێڵن لەوە زیاتر بخوێنمەوە . لە فتبۆڵێنیشدا هەروەها .. ئەوەندە عەزمم بەتین نی یە لە کاتی خۆیدا دەس لە یاری هەڵگرم . هۆی بڕیار نەبردنە سەرم ئەمەیەو لەمە بەولاوە نی یە ..

دۆزینەوەی ئەم هـۆی بڕیار بۆ نەبرانە سـەرەم بەتەواوی سەرسامی کردم . پێشـان خۆم بە پیاوێکی تەواوو خاوەن عەزم زانیبـوو ، کەچی وا ئەبینم کابرایەکی بێ‌کارەو هیچ لێ نەهاتووم‌و هیچم لە ( کوردە ) زیاد نی یە ! بڕیارم‌دا لەوەولا عزمی خۆم بەتین بکەم .. بەڵام ئەبێ چی بکەم تا عەزمم بەتین بێ ؟ ئەبێ ئەوەی حەزم لێ بێ بیکەم ، نەیکەم‌و ، ئەوەی حەزم لێ نەبێ بیکەم ، بیکەم . سبەینان حەزم لە وەرزش نی یە ، زۆر چاکە .. ئەیکەم . ئێواران حـەزم لە فتبۆڵێنە ، نایکەم . حەزم لـە خوێندنەوەی کتێبێکی خۆشە .. نایخوێنمەوە . هەر ئەوڕۆژە بڕیارم دا ئیتر ئەوە

ڕێو شـــوێنم بێ . هەر لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا دایکم کێکێکی جوانی دروست کردبوو لەگەڵ چاییدا بیخۆین ، منیش زۆرم حەز لێ ئەکرد . دایکم باشترین پارچەی ئەو کێکەی دامێ کە پارچەی ناوەڕاستەکەی بوو . بەڵام من چونکە حەزم لێ بوو ، لەســەر بڕیارەکەی خۆم نەمخوارد .. نانم خوارد بە چایەوە !

دایکم لێی پرسیم :

ـ کێکەکەت بۆ نەخوارد ؟

ـ با تا دوو سبەی لە دەوری یەکەی خۆمدا بمێنێتەوە ، ئەوسا ئەیخۆم .

ـ چی یە ، سوێندت خواردووە ؟

ـ بڕیارم داوە . ئەگەر بتوانم تا دوو ڕۆژی تر نەیخـــۆم ئەوە نیشانەی ئەوەتە عەزمم بەتینە !

( لاولاو ) لێی پرسیم :

— ئەی ئەگەر خواردت ؟

— ئەگەر خواردم ئەوە واتە بێ عەزمم . تێ ناگەی ؟

— هەرگیز ئەو بڕیارەت نابەیتە سەر !

— ئەیبینین !

سبەینێ کە لە خەو هەڵسام ئارەزووم لە وەرزش کردن نەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا کردمو چووشــم خۆم دایە بەر بەلووعەی ئاوە ساردەکە ، چونکە ئەوەشم حەز لێ نەبوو !



ئـەنجا بەرچاییم کردو چووم بۆ قوتابخانە . پارچـە کێکەکە هەر لە دەوری یەکەدا بــوو . کە هــاتمەوە تەماشام کرد ئەبینم

هەر لە جێگەکەی خۆیدایەتی . بەلام دایکم سەرقاپی شـــووشەی شەکرەکەی نابوە سەری بۆئەوەی ڕەق هەڵنەیەت تا دوو سبەی کە ئەیخۆم . سەرقاپەکەم هەڵبڕی‌و سەیرێکم کرد ، دیم هێشـتا کزر نەبوەتەوە . هەستم‌کرد حەزئەکەم کورج بیخۆم ، بەلام جلەوی خۆمم بەرنەداو بەری ئەو ئارەزووەی خۆمم گرت ..

ئەو ڕۆژە بڕیارم وابوو فتبۆلێن نەکەم‌و سەعات‌و نیوێ پێش دەس‌کردنم بە پیاچوونەوەی دەرزەکانم بۆ خۆم بحەسێمەوە . بەلام نازانم چۆن بحەسێمەوە ؟ حەسانەوە بە قسە نابێ ! حەســانەوە یا یاری‌یە یا ئیشێکی بەتامە . منیش نە یاری هەیە بیکەم‌و نە ئیشیشم هەیە ! کەواتە ئەبێ چی‌بکەم ؟ هــەر ئەبێ بچمەوە بۆ فتبۆلێن لەگەڵ ئاوەڵەکانم ..

وەختی ئەوەم نەبوو وەلامی خۆم بدەمەوە . قاچــەکانم لە خۆیانەوە هەڵیان‌گرتم‌و بردمیانە سەرجادە ، بەلام پارچە کێکەکــە هەر لە دەوری‌یەکەدا مایەوە

کاتێك کە بە ڕێگــاوە بووم کوتوپڕ بیرم کردەوەو بە خۆمم وت : « ڕاوەســتە ! خەریکی چیم ؟ مادەم حــەزم لە فتبۆڵێنە ئەبێ نەیکــەم . پیاو عەزمی خۆی وا پێ بەهێز ناکرێ » . ئەمویست بە ڕێگەکــەی خۆمدا بگەڕێمەوەو بێمە دواوە ، کەچی ئەبینم وا خۆم بە خۆم ئەڵێم هەرچۆن بێ هەر ئەڕۆم بزانم برادەرەکانم چون یاری ئەکەن ، بەلام خۆم یاری ناکەم . گەیشتمە لایان‌و دەسم‌کرد بە تەماشا کردنیان ، لە گەرمەی یاری کردنا بوون . ( کوردە ) دیمی ، بانگی کردم :

— ئەوە لەکوێ‌یت ؟ وەرە فریامان کەوە ، دە گۆڵیان لێ کردووین !

ئەمزانی چۆن بوو ، خۆم لە کۆڕی یاری یەکەدا دی !

ئەمجـارەش هەروا درەنگ گەڕامەوە بۆ ماڵ . بیرێکم کردەوەو لە دڵی خۆما بە خۆمم وت : « وادیارە هێشـتا هەر بێ عەزمی ! ئەمڕۆت لە سەرەتاوە باش هێنا ، بەڵام فتبۆڵینەکـە گووی کردە هەمووی ! »

پارچە کێکەکە هێشـتا هەر لە دەوری یەکەدا بوو ، خواردم ! مـادەم بێ عەزمم ، ئیتر بۆ لەویـا بهێنێتەوە ؟ بیخۆم و نەیخۆم چونیەکە !

( لاولاو ) هاتەوە ، سەیری دەوری یەکەی کرد ئەبینێ خاڵی یە !

— نەت بردە سەر !

— چیم نەبردە سەر ؟

— کێکەکەت خوارد !

— باشە ، ئیتر چی ؟ تۆ هەقت چی یە ؟ خۆ کێکی تۆ نی یە !

— جا بۆ تووڕە ئەبی ؟ من چیم وتووە ؟ بەڕاسـتی خۆت زۆر ڕاگرت ! وەی عەزمێکی چەند بەهێزت هەیە ! من هیچ عەزمم نی یە !

— بۆ ؟

— نازانم بۆ ! ئەگەر ماوەیەکی تر چـاوەڕوانیت بکردایەو کێکەکەت نەخواردایە ، لاموایە من ئەمخوارد .

— کەوایە ، بە خاوەن عەزمم ئەزانی ؟

— دیارە !

ئەم قسەیەی ( لاولاو ) کەمێك دڵی دامەوە . هەرچەند ئەمڕۆ

ئەم‌بردە سەر ، ئەبێ سبەینێ لەســەر پەروەردە کردنی عەزمی خۆم هەر بەردەوام بم .

نازانم ئەگەر سبەینێ دنیا خۆش بووایە چۆن ئەبوو . سبەینێ هەر لە بەیانی‌یەوە دای‌کردە باران‌و ئەوەی ( کوردە ) لێی‌ئەترسا هاتەدی . تەختانی جێ یاری‌یەکەمان بووبوو بە قوڕ . بنیادەم کە نەتوانێ یاری بکا حەزیشی لێ ناکا ! ڕەوشتی بنیادەم چەند سەیرە ! ئەگەر خەڵك خەریکی یاری بن‌و ئەو لە ماڵ دەرنەچێ نازانێ چی بکا ؟ لە دڵی خۆیدا ئەڵێ : « بەدبەخت خۆم ! ئاوەڵەکـانم وا لەدەرەوە یاری ئەکەن‌و من بۆ خۆم لە ماڵا کەوتووم . ! » بەڵام کە زانی خەڵکیش لە ماڵا کەوتوون‌و کەس یاری ناکا ، ئەویش بیری‌وا ناکاتەوەو یاری نایەت بە دڵیا .

هەر وایش بوو .. لە پەنجەرەکەوە دیم پایزە بارانێـکی ورد ئەباری .. بە دڵێکی هێمنەوە دەسم‌کـرد بە ئیش . بە ئارەزووی خۆم بەسەر هەموو دەرزەکانما هاتمەوە تا گەیشتمە ســەر دەرزی ژمارە . لە دڵی خۆما وتم ژمارە ئەم هەموو دەردی ســەری‌یەی ناوێ - توخوا وا نی‌یە ؟ - باشـتر ئەوەیە بچم بۆلای برادەرێك یارمەتیم بدا !

گورج دەفتەرەکانم پێچایەوەو چووم بۆ لای ( پشکۆ ) . ( پشکۆ ) لە ژمارەدا لە هەموو قوتابی‌یەکانی تاقمەکەمان باشترەو هەمیشـــە پلەی ( زۆر چاك )ی تیا وەرئەگرێ .

کە گەیشتمە ماڵیان ئەبینم بە تەنها خۆی لەســەر کورسی‌یەك دانیشتووە شەترنج ئەکا . وتی :

لە وەختێکی باشا هاتی .. وەرە دەستێك شەترنج بکەین ..

وتم :

— من بۆ شەترەنج کردن نەهاتووم ، هاتووم یارمەتیم بدەی ، دەرزی ژمارەکەم بۆ لێك بدەیتەوە . یارمەتیم ئەدەی یا نە ؟

— باشە ، هەر ئیستا . بەڵام خۆت ئەزانی وەختێکی زۆرمان بەدەستەوەیە بۆ پرسیار لێکدانەوە . پرسیار لێکدانەوە ئەوەندە زۆری پێناوێ با دەستێك شەترەنج بکەین . هەرچون بێ ئەبێ فێری شەترەنج ببی . هیچ شتێ وەك شەترنج دەماری ژمارە زانین بەهێز ناکا .

— بەڕاستتە ؟

— بە سەری باوکم ! تۆ نازانی من بۆچی وا لە ژمارەدا بەهێزم ؟ لەبەرئەوەیە کە شەترەنج ئەکەم ..

بەگوێم کرد .



داشەکانمان داناو دەسمان کرد بە یاری ، بەڵام هەر کوتوپڕ تێگەیشتم یاریم پێ ناکرێ لەگەڵیا ، چونکە هەمیشە تووڕە ئەبێ . هەر یارییەکی کردو بۆینەهات گورج خۆی تووڕە ئەکاو ئەشیڕینێ :

— من بە عومری خۆم یارییوام نەدیوە ! بۆ کوێ ئەچی ؟

یاری ڕاستەقینە ئاوا ئەبێ ! نا ! نابێ ئەو داشە بجوولێنی .

— بۆ نابێ بیجوولێنم ؟

— چونکە من ئەیخۆم !

— هێواش .. برا ، هێواش ! بیخۆ، مەقیڕێنە !

— چۆن نەقیڕێنم ؟! تۆ وەك چوارپێ یاری ئەکەی !

— ئەوە بۆ تۆ باشترە .. زوو ئەیبەیتەوە .

— من ئەمەوێ لەگەڵ یەکێکی زیرەك یاری بکەم ، نەك لەگەڵ یاریکەرێکی وەك تۆ ..

— من زیرەك نیم ؟

— زۆر ، نە !

بەمجۆرە لە هەموو جووڵەیەکما جنێوێکی ئەدامێ ، کەچی هەر کە لێیشی بردمەوە وتی :

— وەرە با دەستێکی تریش بکەین ..

تووڕە بووبووم . ویستم یارییەکی وای لەگەڵ بکەم پێی بدۆڕێنم تا ئیتر خۆی ئەوەندە بە زیرەك نەزانێ .

ـ باشـە یاری ئەکەین ، بەڵام بە بێ قیڕەقیڕ . ئەمجار ئەگەر بقیڕێنی دەست لە هەمووشتێ هەڵئەگرمو ئەڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆمان .

دەسمانکرد بە یاری . ئەمجار وەك جاری پێشـوو نەیئەقیڕاند . بەڵام هەستم کرد ناتوانێ بێدەنگ یاری بکا . بەدرێژایی یارییەکە وەك تووتی قسەی هەلەق مەلەقی ئەکردو گاڵتەی پێئەکردم :

ـ ئای .. ئای .. میرم یاری وا ئەکەی ؟! باشە ، زۆر باشـە ! بەڵام ئەڵێن تۆ زیرەکت لێدەرئەچێ .. شـتی‌وات دیوە ؟ نابێ ، ئەمە نابێ !

نەم‌نەتوانی گوێ بۆ ئەم قسانەی شل بکەم .

ئەمجارەش دۆڕاندم . لەیادم نەماوە چەنـد دەستی‌تریشـم لەگەڵ کردو دۆڕاندم .

. ئەوجا دەستمان دایە دەفتەری ژمارەکە . لەمەشا توانی بەدخوویی خۆی دەربڕێ . نەی‌ئەتوانی بە هێمنی بۆم لێک‌داتەوە .

ـ ئاسانە ، بۆ تێی‌ناگەی ؟ منالێکی بچووك بووایە تێ‌ئەگەیی ! باشە ، چی تێ‌نەگەیشتی ؟ خۆ ئەمەمان لە پۆلی سـێدا خوێند . تۆ پۆلی سێت لەکوێ تەواو کردوە ، لە مانگ ؟

منیش پێم‌وت :

ـ ئەگەر ناتوانی بەئاسـانی بۆم لێك دەیتەوە ئەڕۆم لـە یەکێکی‌تر ئەپرسم .

ـ من ؟ من بەئاسانی لێکی‌ئەدەمەوە ، بەڵام تۆ تێ‌ناگەی !

ـ بەئاسانی لێکی‌ئەدەیتەوە ؟ ئەوەی کە پێویستە بۆمی لێك دەرەوەو هەقت بەسەر ئەوەوە نەبێ پۆلی سێهەمم لەکوێ تەواو کردووە .

ـ باشە ، زیز مەبە . ئێسـتا بـە شـێوەیەکی سـادە بۆت لێك‌ئەدەمەوە .

بەلام لەتوانایا نەبوو وا کە ئەڵێ بۆم لێك‌داتەوە . تـا ئێوارە لەگەڵی بووم . کە بەجێم‌هێشت لەوانەیە بڵێم هیچی لێ حاڵی نەبووبووم ! لە هەموو ناخۆشتریش ئەوەبوو تاقە دەستێك شەترنجم لێ نەبردەوە . ئەگەر گـاڵتەی پێ نەکردمایە مەبەسـتم نەبوو ، بەڵام مادەم گاڵتەم پێ‌ئەکا ئەبێ هەر لێی‌بەرمەوە . هەموو ڕۆژێ ئەچووم بۆلای بۆ فێربوونی ژمـارەو چەند سەعاتیش پێکەوە شەترنجمان ئەکرد .

وردە وردە فێری یاری‌کردن بووم .. جاروباریش پێم‌ئەدۆڕاند .

ڕاسته ئه‌مه که‌مجار ڕووی ئه‌دا ، به‌ڵام به‌وجارانه زۆر دڵشــاد ئه‌بووم . له‌پێشـــانا که ئه‌یدی وا ئه‌یدۆڕێنێ وازی له چه‌نه‌بازی‌یه تووتی ئاسایی‌یه‌که‌ی ئه‌هێناو ، هه‌ناسه‌یه‌کی ساردی هه‌ڵئه‌کێشا ، ئه‌نجا له شوێنه‌که‌ی خۆیدا ڕاست ئه‌بووه‌وه‌و دائه‌نیشته‌وه‌و ســه‌ری خۆی به هه‌ر دوو ده‌ستی ئه‌وشارد .. هه‌رکه‌س بیدی‌یایه پێ‌که‌نینی پێ‌ئه‌هات ، به‌ڵام من وه‌ك ئه‌و نه‌بووم . ئه‌گه‌ر بمدۆڕاندایه تووڕه نه‌ئه‌بووم‌و که ئه‌و ئه‌یدۆڕاند شاکامیم پێ‌نه‌ئه‌هێناو دڵشاد نه‌ئه‌بووم . که‌چی ئه‌و که بیدۆڕاندایه له‌وانه‌بوو له‌داخانا تووك به ســه‌ری خۆیه‌وه نه‌هێڵێ ..



بۆئه‌وه‌ی فێر ببم باش یاری بکه‌م ، له ماڵیشـــا له‌گه‌ڵ باوکم‌و ( لاولاو ) یاریم ئه‌کرد . باوکم ڕۆژێکیان بۆی گێڕامه‌وه که کتێبێکی هه‌یه باسی شـــه‌ترنج ئه‌کاو پێ‌ی وتم ئه‌گه‌ر حه‌زئه‌که‌ی باش فێری یاری ببی بیخوێنه‌ره‌وه . ده‌س‌به‌جێ که‌وتمه گه‌ڕان به‌دوایا تا دۆزیمه‌وه له‌گه‌ڵ چـــه‌ند کتێبێکی‌تری کۆندا له‌ناو سندووقێکدا دانرابوو . پێشان لام‌وابوو هیچی لێ حاڵی نابم ،

بەڵام کە دەسمکرد بە خوێندنەوەی ، ئەبینم زۆر باش لێکدراوەتەوە . لەوکتێبەدا نووسرابوو شەترنج وەك جەنگ وایە ئەبێ یاریکەر دەسپێشخەریی تیا بکاو زوو داشەکانی خۆی بجووڵێنێو ڕیزی دوژمن بسمێو هێرش بەرێتە سەر شاکەی . هەروەها باسی ئەوەشی تیا کرابوو کە چون دەس بە یاری ئەکرێو چۆن هێرشو بەرگری ڕێك ئەخرێنو ، هەندێ قسەو باسی بەکەڵکی تریشی تیابوو .

بە دوو ڕۆژ کتێبەکەم خوێندەوە . ڕۆژی سێهەم کە چووم بۆماڵی ( پشکۆ ) لە هەموو دەستەکانا پێمدۆڕاند . ( پشکۆ ) نەیزانی هۆی ئەوە چی بوو ؟ وەزع گۆڕا . پاش چەند ڕۆژێك کار گەیشتە ڕادەیەك بە ڕێکەوتیش جارێکی لێ نەئەبردمەوە چونکە من بەهێزتر بووبووم لەو .

لە سایەی سەری شەترنجەوە وەختێکی زۆرم نەئەما بۆ لێکۆڵینەوەی دەرزی ژمارە . ( پشکۆ ) بە پەلەپەل بۆی لێك ئەدامەوە . شەترنج زانینەکەم هیچ دادی نەدامو لە دەرزی ژمارەدا هیچ بەهێزتری نەکردم . لەبەرئەوە بڕیارم دا دەستی لێ هەڵگرمو وازم لێهێنا . تاقەتی یاری کردنیشم لەگەل ( پشکۆ ) نەما ، چونکە هەمیشە هەر ئەیدۆڕاند . پێموت :

— ئیتر یاریت لەگەڵ ناکەم !

سەری سوڕما ، وتی :

— بۆ ؟ دەستت لە شەترنج هەڵگرتووە ؟ بەڵام تۆ توانایەکی باشت هەیەو لەوانەیە ئەگەر بەردەوام بی لە یاری کردنا یاریکەرێکی هەڵکەوتووت لێ دەرچێ ..

— توانام نییە . وەنەبێ ئەم بەینە بە بێی خۆم بردبێتمەوە .

سەیری کتێبم ئەکرد .

— کتێبی چی ؟

— کتێبێکم هەیە باسی شەترنج ئەکا . ئەگەر ئارەزووت لێیە بۆت دێنم بیخوێنەرەوە ، تۆش وەك من فێری یاریکردن ئەبی .

پەلەی بوو بۆئەوەی ئەو کتێبە وەربگرێ ، لەگــەڵ خۆم بردم بۆ ماڵی خۆمانو کتێبەکەم دایە . بە ڕاکردن گەڕایەوە .

بۆ خۆیشـــم بڕیارمدا تا بەتەواوی لە دەرزی ژمارەدا بەهێز نەبم جارێکیتر یاری شەترنج نەکەم .



# بەشی حەوتەم



(کامەران)ی ئامۆژگاری کەرمان پێشنیاری کرد کەوا ئاهەنگ دۆستەکانی قوتابخانە ئاهەنگێکی شەونشینی ساز بکەن . لەسەر ئەو پێشنیارە هەندێ لە قوتابی یەکان بڕیاریان دا چەند شیعرێك لەبەربکەنو لە شەوی ئاهەنگەکەدا بچنە سەر شانۆ بیخوێننەوە . هەندێکیشان ویستیان نومایشێکی وەرزشی ڕێك خەنو لە خۆیان کەلەکەترێ یەك دروست بکەن . (شێرکۆ) یش وتی منیش (بلالانکا -١-) تان بۆ لێ ئەدەم . (پیرۆت) یش گفتیدا سەمای (کۆپاك) بکا . بەڵام بیری بەجێ لای (ئازاد) و (ئارام) بوو کە ویستیان لەسەر شیعری (ڕۆسلانو لۆدمیلا)ی (پوشکین) لاسایی (کێشەی ڕۆسلانو کەللەسەر) بکەنەوە کە شیعرەکەی لە خوێندنەوەی زمانی ڕەسەنی نەتەوەیی پۆلی چوارەمدا هەیەو زۆر نی یە خوێندوومانە . (ئارام) یش وتی کەللەسەرە زەلامەکە لە چەرمێکی نەرم دروست ئەکاو هەموو چەشنە بۆیەیەکی لێ ئەدا بۆئەوە بەسام بێو خۆی لەناویا ئەشارێتەوەو دەس ئەکا بە قسە . (ئازاد) یش دەوری (ڕۆسلان) ئەبینێو ڕمێکی

(١) ئالەتێکی مۆسیقای میللی ی ڕووسی یە سێ ژێی هەیە .

دارێن دروست ئەکا بۆئەوەی کەللەسەرەکەی پێ بدا بە عەرزا .

منو (کوردە)یش زۆرمان حەز ئەکرد لەم ئاهەنگی شەونشینی‌یەدا بەشدار بین . چووینە لای ( ئاواز خان ) بۆئەوەی ڕێگەمان بـدا ، بەڵام ڕێگەی نەداینو ، وای وەڵام داینەوە :

— جارێ پلە ( خراپ ) ەکانتان ڕاستکەنەوە ، ئەوجا وەرن داوای دەور گێڕان بکەن !

هـاوڕێکانمان هەموو دەسیان کرد بـە پڕاوەکردنی دەورەکانی خۆیان . منو ( کوردە ) یش بە هۆڵەکەدا ئەهاتینو ئەچووین ، وەك یەکێ تامەزرۆ بێ هەر سەیری ئەوانمان ئەکرد . ( ئارام ) پارچـە چەرمێکی ناسکی هێنا کەالە سەرە زەبەللاحەکەی لێ دروستکردو دەمو کەلاوەی بەجیـا بۆ کردو بە بزمار پێیەوە لکانـد بۆئەوەی بەئاسانی بکرێتەوە ، ئەنجا ســەرەکەی ڕەنگ‌کردو جووتێ چاوی گەورەی بۆ دروستکرد ، کە ئەچووە ناوی‌و دەمەکەی ئەجووڵاندەوەو قسەی ئەکردو ئەی‌نەڕاند وەك بڵێی کەللەسەرێکی ڕاستەقینە بێ ، وابوو . ئەبوو ڕۆسلانیش ببینین کە ( ئازاد ) دەوری ئەوی ئەدی ، بە سەرە ڕمەکەیەوە هێرش بەرێتە سەر کەللەسەرەکەو کەللەسەرەکەش فووی لێ بکا وەك بڵێی ڕەشەبایە تلی ئەدا .

ڕۆژێکیان ( کوردە ) خەیاڵێکی سەیری‌کرد ، وتی :

— دوێنێ چیرۆکی ( ڕۆسلانو لۆدمیلا ) م ئەخوێندەوە ، ئەبینم تیایدا نووسراوە ڕۆسلان سواری ئەسپ بووە ، کەچی ڕۆسلانەکەی ئێمە بە پێ ئەڕوا .

— جا ئەسپی لەکوێ بۆ بێنین ؟ هەتاوەکو ئەگەر دەسیشمان کەوێ ناتوانین وای‌لێ‌بکەین سەرکەوێ بۆ سەر تەختەی شانۆکە .

— من شتێکی سەیرم بە بیرا هاتووە : بە هەردوکمانەوە ببین بە ئەسپ !

— لە گۆڤاری ( گاڵتەوگەپ ) دا باسی ئەوەم بەرچاو کەوتووە کە چۆن ئەتوانرێ بە دوو منداڵ ئەسپێکی سەرشانۆ دروست بکرێ . ئەبێ پێستی ئەسپەکە لە قوماش دروست بکەین . لەبەرەوە سەرەکەی و لەدواوە کلکەکەی و لە خوارەوە چوار پەلەکەی . ئەنجا من لەپێشەوە ئەچمە ناو پێستەکەو سەرم ئەخەمە جێی کەللەی ئەسپەکە . تۆیش لەدواوە تێی ئەچیو خۆت ئەچەمێنیتەوەو ناوقەدی من ئەگری . پشتت ئەبێ بە پشتی ئەسپەکە . ئەسپ چوار پەلی هەیە . ئێمەش بە هەردوکمانەوە چوار پێمان هەیە . تۆ هەر ئەوەندەت لەسەر ئەبێ من بۆ هەرکوێ چووم تۆش لەگەڵم بی .. ئەسپ !

— ئەی پێستەکە چۆن بدروین ؟ ئەگەر کچ بووینایە ئاسان



بوو . کچان درووماں ئەزانن ، لە قوتابخانەدا دەرزی درووماں ئەخوێنن .

— داوا لە ( لاولاو ) ی خوشکم ئەکەم یارمەتیمان بدا .

کە گەڕامەوە بۆ ماڵ بیرەکەی خۆمانم بۆ ( لاولاو ) گێڕایەوە ، وتی چاکە ، بەلام قوماش بێنن .

بیرمان لەوە ئەکردەوە قوماشمان چۆن دەس کەوێ . ئاخری ( کوردە ) لە سەربانەکەی ماڵی خۆیان بەتانی یە کۆنێکی دۆزی یەوە بۆ هیچ بەکاریان نەئەهێنا . هێنامان پیشانی ( لاولاو ) مان دا وتی ڕەنگ بێ بەش بکا . مەقەسێکی هێناو بەتانی یەکەی کرد بە دوو پارچەی گەورەوە . داواشی لێ کردین لەسەر پارچەیەکیان وێنەیەکی گەورەی ئەسپێك بکێشین . پارچە دەباشێرێکمان هێناو وێنەی ئەسپێکمان کێشا . سەرێك و درو پەلمان بۆ کرد . ئەنجا ( لاولاو ) هەردوو پارچەکەی نایە سەر یەك و بە مەقەست بڕینی . لە هەر پارچەیەکیان نیوە ئەسپێك دەرچوو . جا هەردوو ڕووەکەی نایە سەر یەك و پێکەوەی دادوورین . منو ( کوردە ) یش سەرو دەرزیمان بە دەستەوە بوو یارمەتیمان ئەداو درووماننمان لەگەڵدا ئەکرد . لە هەمووی زەحمەتتر دووریني چوار پەلەکەی بوو چونکە ئەبوو وەك لووله بیدوورین . دەرزی یەکی زۆر چوو بە دەستمانا بەلام ئاخری ئیشەکەمان هەر تەواو کرد . بۆ سبەینێ کاو گوشیشمان پەیدا کردو لەسەر ئیشی خۆمان ڕۆیشتین . کامان کردە کەللەی ئەسپەکە تا قنج ڕاوەستێ و لە گوشیش کلك و یاڵمان بۆ دروستکرد .

کە هەموو شتێ تەواو بوو لە کونێکەوە کە لەژێر سنگی پێستەکەدا هێڵرابووەوە ، چووینە ناوی . ئەمانویست هەندێ بڕۆین بە ڕێدا تا ( لاولاو ) پێمان پێ بکەنێ . ( لاولاو ) کە لەناو پێستەکەدا دینی

وتی بەڕاستی ئەسپی چاکە ، بەڵام کەمێك لاوازە ، ئەبێ کا بکەینە هەندێ شوێنی تریشیەوە . لێی هاتینە دەرەوە چونکە لەبەرئەوە کە لە قوماش دروست کرابوو ئەبوو ڕەنگ بکرێ . هەر کوێی تری تەقەڵی ئەویست ( لاولاو ) لێی ئەدا . ( کوردە ) یش چوو لە ماڵی خۆیان بۆیاخی هێنا . وا ئیستا بووین بە خاوەنی ئەســپە کوتێکی ڕاستەقینە . ڕەنگیشمان بو ڕەنگ‌کردنی جێگای چاوو کونە لووتی هێنا . ( لاولاو ) بە خەیاڵیا هات جووتێ گوێیشی بو بدوورێ چونکە ئەگەر گوێی نەبێ ناشیرینی لێ دەرئەچێ . ئەمجاریش چووینەوە ناوی‌و ( کوردە ) وەك ئەسپ دەستی بە حیلکە حیلك کرد :

— « هی - هی - هی هی ! »

( لاولاو ) لەبەر پێکەنین ئەوەندەی نەمابوو خەش بکا . بە هەردوو دەست ئەیدا بە یەکداو پڕ بە دەم هاواری ئەکرد :

— ئەسپێکی ڕاستەقینەو تەواوە !

ویستمان بە ناو ژوورەکەدا کەمێك غارغارێن بکەین‌و جووتە بهاوێین ! دیاربوو لەمەشدا سەرکەوتین ، چونکە ( لاولاو ) لە پێکەنین نەئەکەوت . دایکیشم کە هات دیی تێر تێر پێکەنی . کە باوکیشم لە ئیش هاتەوە ئەویش هاتە سەیرمان‌و گەلێك پێکەنی . باوکم لێی پرسین :

— ئەمەتان بۆچی کردووە ؟

بۆمان باس‌کرد کە بەم‌نزیکانە لە قوتابخانەکەماندا لاسایی‌یەك ئەکرێتەوەو دەوری من‌و ( کوردە ) یش لەم لاســایی‌یەدا ئەوەتە ببین بە ئەسپ .

— شتی چاکە قوتابخانەکەتان ڕابواردنی‌وای بۆ قوتابی‌یەکان

تیابێ . وادیاره قوتابی یەکانتان فێری شتی چاك ئەبن . پێم بڵێن کەی ئەم ئاهەنگە ئەکەن تا منیش بێم بۆ سەیر ؟

پاشان لەگەڵ ( کوردە ) چووم بۆ ماڵی ئەوان تا ئەسپەکە پیشانی دایکی و پووری بدەین . لە ڕێدا پێم وت سەیر ئەوەیە باوکم بێت بۆ تەماشاو نەشهێڵن ئێمە دەوری خۆمان ببینین .

— تۆ لای کەس هیچ مەدرکێنە . ئێمە خۆمان لەپشتی شانۆکەوە ڕائەگرین و بە ( ئازاد ) یش ئەڵێین بەرلەوەی بچێتە سەر تەختەی شانۆ سواری ئەسپەکە بێ .

— وایە !

بە دڵ و دایەن چاوەڕوانی ڕۆژی لاسـایی یەکە بووین . بەهۆی ئەمەوە پێمان نەئەکرا بە باشی خەریکی خوێندنەکەمان ببین . هەموو ڕۆژێ ئەچووینە ناو پێستی ئەسپەکەوەو مەشـقمان ئەکرد . ( لاولاو ) یش بەدرێژایی وەخت کای ئەئاخنی یە ناوی . ئەسـپەکەی ئەوەندە ساف و لووس کرد وەك ولاخێکی قەڵەوی لێ هات . بۆ ئەوەش کە گوێچکەکانی دانەتەپێن زەنبەلەکی تێ خستن . ( لاولاو ) عەقڵی بڕی دوو تاڵە دەزوویشیان پێوە ببەستێ تا هەرکاتێ کە ڕای کێشان بو سەرەوە گوێچکەکان قنج ببنەوە ،

ئاخری ڕۆژی لاسایی یەکە هات .

بێ ئەوەی کەس چاوی لێ بێ پێستەکەمان هەڵگرت و بردمان لەودیوی شانۆکەوە شاردمانەوە . کە ( ئازاد ) مان دی ( هیوا ) بانگی کردو مەسەلەکەی بۆ باس کرد :

— ( ئازاد ) ا گوێت لێ بێ .. بەرلەوەی بچیتە سـەر شانۆ کەللەسەرەکە برمێنی ، سەرێ لەودیوی پەردەکە بدە . ئەسپێکت بۆ ئامادە کراوە سواری ببە ، ئەوسا بچۆرە سەر شانۆ .

— ئەسپی چی ؟

— مەیکە بە غایلەی دڵت . ئەسپێکی جوانە ، ســواری بەو بۆ خۆت لێیخوڕە .

— نازانم .. من بە بێ ئەسپ پراوەم کردوە .

دیارە هیچو پووچی ، ئەسپت بێ جوانترە . لە شیعرەکەی پوشکیندا وا نووسراوە : ڕوسلان سواری ئەسپێك بوو . لە یادت نی‌یە ئەڵێ : «سوار ئەبم ، بێئەوەی گۆرانی بڵێم یا فیکـە بکێشم ، ئەڕۆم » ؟ . باشـە ئەگەر ئەسپی لەژێرا نەبێ چۆن سـوار ئەبێ ئەڕوا ؟ لە کتێبی خوێندنەوەشـدا وێنەی ڕۆسـلان بە سـواریی ئەسپەوە کێشراوە .

( ئازاد ) وتی :

— ڕاست ئەکەی جوان نی‌یە بنیادەم بە پێ بڕوا . قارە مانان بە سواریی ئەسپ دێن .

( کوردە ) ئەنجا وتی :

— بەڵام نابێ ، ها ! ئەمە بە کەس بڵێی ، چونکە تامی لەپڕی‌یە کەی نامێنێ .

— باشە !

بەدزی‌یەوە خۆمان گەیاندە ئەودیوی پەردەی شـانۆکە ، پێستی ئەسـپەکەمان هێنا . چاوەڕوان بووین . لەوماوەیەدا خەڵکەکەش هاتنە ژوورەوە . منداڵەکان بە راستو چەپی شانۆکەدا ئەهاتن و ئەچوون ، تەماشای دیکۆرەکەیان ئەکرد ، زەنگی دوایی ـ کەنیشانەی دەس‌پێ کردنی پیشاندانە ـ لێدرا . گوێمان لە منداڵەکان بوو کە شیعریان ئەخوێندەوەو ، چاویشمان لە نومـایشە وەرزشی‌یەکەیانەوە بوو . ئەوەی کە زۆرم لا جوان بوو وەرزش کردنی منداڵەکان بـوو

لەسەر ئاوازی مۆسـیقا کە زۆر بەزەحمەت فێری بووبوونو پانزە ڕۆژی ڕەبەق پراوەیان بۆ کردبوو ، پەردە دادرایەوە . کەللەسەرەکە کورج برایە سـەر شانۆ ، تەقەتەقی دانی ئەهات ، ( ئارام )یش خۆی لەناویا شـاردبووەوە . ( ئازاد )یش لەولاوە پەیـدا بوو ، خووەیەکی مەقەبای بریقەداری لەسەر نابوو ، ڕمێکی داریی بۆیاخ زیوینی بەدەستەوە بوو ، هاتە لامانەوە وتی :

— ئەی ئەسپەکە کوا ؟

— هەر ئێستا !

دەس‌بەجێ خۆمان کرد بەناو پێستەکەدا . ئەسپێکی ڕێك‌وپێك لە بەردەمی ( ئازاد ) دا قنج بووەوە . پیم‌وت :

— سوار بە !

هاتە کۆڵمان . ئا لەوکاتەدا تێ‌گەیشتم وەنەبێ شتێکی خۆش بێ بۆم ببم بە ئەسپ چونکە ( ئازاد ) گەلێك قورس بوو ، بەڕەنگێ لەوانەبوو نەتوانم هەڵی‌گرم . ئەبوو دەست بە پشتێنەکەی (کوردە) وە بگرم تا خۆم پێ ڕاگیر کرێو نەکەوم . هەر لەوکاتەدا پەردە لادرا .

( ئازاد ) واتە ڕۆسلان ، وتی :

— یاڵلا . . بجووڵێن !

منو ( کوردە ) بەرەو شـانۆکە بۆپێشەوە چووین . برادەرەکان لە هۆڵەکەدا دایانە هاڕەی پێکەنین . دیاربوو ئەسپەکەمان ئەسپێکی تەواو بوو ، بەرەو کەللەسەرەکە ئەچوو . ڕۆسلان مرقاندی :

— هێی . . لەسـەرخۆ . . بۆکوێ ؟ ئەوەندەی نەمـاوە خۆتان بکەن بەناو کەللە سەرەکەدا . بگەڕێنە دواوە !

گەڕاینەوە .



دانیشتووانی ناو هۆڵەکە دایانەوە هارەی پێکەنین .

( ئازاد ) جڵەوەکەی توند کردینەوە :

— کەرینە ! بەمچەشنە مەگەرێنە دواوە .. پێچ کەنەوەو .. بمبەنە ناوەراستی شانۆکە . ( ئازاد ) دەنگی خۆی زوڵاڵ کردو نەراندی :

— « دەشتەکە ! کێ وا پری کردووی لە ئێسکی مردوو ؟ ! »

هێشتا لە خوێندنەوەی شیعرەکانی نەبووبووەوە ، لە بەرخۆیەوە ئەیخوێندنەوە ، ( کوردە ) تاڵە دەزووەکانی راکێشا . هەردوو گوێی ئەسپەکە قنجبوونەوە . دانیشتووەکان ئەوەیان زۆر پێ خۆش بوو . ( ئازاد ) پاشئەوەی لە خوێندنەوەی شیعرەکان بووەوە ، بەئاستەم پێی وتین :

— ئیستا ، دەی !

پێچمان کردەوەو هێرشێکمان بردە سەر کەللەسەرەکە . هێشتا نزیکەی پێنج هەنگاومان مابوو بگەینە سەری ، ( کوردە ) دەستی کرد بە حیلەکە ـ حیلك . کوتووپڕ لەجێی خۆیا وەستا . خۆی وا پیشاندا گوایە چەپۆکان ئەکا . منیش لەدواوە دەستم کرد بە جووتە هاویشتن تا وا پیشانبدەین ئەسپەکە لە کەللەسەرەکە ئەترسێ . ڕۆسلانیش دایە ئاوزەنگی لێدان . بە قۆندەرەکانی ئەیدا بە کەلەکەما ، کەلێکی ئازار پێ ئەگەیاندم . چووینە پێشەوە بۆسەر



کەللەسەرەکە . ڕۆسلان بە نووکی ڕمەکەی ختووکەی لووتی ئەدا . کەللەسەر دەمی داپچڕیو پژمەیەکی کرد . ئێمەش قەلەمبازێکمان بۆ دواوە بردو بە چوار دەوری شانۆکەدا ، وەك با هەڵی گرتبین ، دامانە غار . ئەوەندەی نەمابو ڕۆسلان داکەوێ . (کوردە) ناچاری کردم بە یەك پێ بڕۆم . زۆرم ئازار پێ ئەگەیشت . کەوتمە شەلەشەل . (ئازاد) دیسانەوە کەوتەوە قاچ تێ ژەندنم . هێرشێکی ترمان

بردەوە سەر کەللەسەرەکەو ، ئەویش هەر دووری ئەخستینەوە لەخۆی . چەند جارێك وامانکرد . ئاخری گەیشتە گیانم ، داوام لە (ئازاد) کرد بەزەیی پیاما بێتەوە :

— دە زووکە .. بیبرەوە ! لەتوا ئاما نەماوە ، قاچم دێشێ ..

بۆ دواجار هێرشمان بردە سەر کەللە سەرەکە . (ئازاد) ڕمێکی لێدا . کەللەسەر کەوتو دیمەنەکە دوایی هات . ئەسپەکەش بـە شەلەشەل شانۆی بەجێهێشت . برادەرەکان تێکڕا دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان . ( ئازاد ) دابەزی چوو سڵاو لە خەڵکەکە بکا ، وەك بڵێی لاسایی کەرەوەیەکی ڕاستەقینەیە .

( کوردە ) وتی :

— ئێمەش لاسایی‌مان کردووەتەوە . ئەبێ پێکەوە بڕۆین سڵاو لە خەڵکەکە بکەین ..

دانیشتووەکان دییان وا ئەسپەکە هاتەوە سـەر شانۆ بۆ سڵاو کردن ، واتە بۆ سەر لەقاندن لە بەرابەریانـدا . زۆریان پێخۆش بوو . دەنگە دەنگو غەلبە غەڵبێکی زۆر پەیدا بوو . چەپڵە ڕێزانێکی گەرمتریان بۆ کردین . کە سڵاوەکەمان لە خەڵکەکە کرد بە غار گەڕاینـە دواوەو دیسـانەوە جارێکی‌تریش هاتینەوە سڵاومان لێ کردن .. لێرەدا بـوو ( کامەران ) پەردەی دادایەوە . ویستمان ڕاکەین‌و خۆمان دەرباز کەین ، ( کامەران ) دەسـتی برد گوێی ئەسپەکەی گرت‌و وتی :

— وەرنە دەرەوە ! ئێوە کێن خۆتانتان وا کەر کردوە ؟.

پێستەکەمان لە خۆمان داماڵی . ( کامەران ) وتی :

— ئای ئەوە ئێوەن ! کێ وتی گاڵتەی‌وا بکەن ؟

کوردە بە سەرسامی‌یەکەوە وتی :

— بۆچی ئەسپەکەمان ناتەواو بوو ؟

— ئەسپەکەتان تەواو بوو ، بەڵام خۆتان نەتان ئەزانی باش تەمسیل بکەن . قسەی سەر شانۆکە لە قسەی ڕاستەقینە ئەچوو . ئەسپەکەش بەدرێژایی وەخت هەر چەپۆکانی بوو .. لەکوێ ئەسپی واتان دیوە هەمیشە هەر چەپۆکانی بێ !

— بنیادەم هیچ نەجووڵێتەوە ، ماندوو ئەبێ . بەتایبەتی من (ئازاد) یشم بەکۆڵەوە بوو . تۆ نازانی ( ئازاد ) چەند قورسە . چارمان نەبوو ، نەمان ئەتوانی هێمن بۆ خۆمان داکەوین .

— ئەبوو لەسەر شانۆکە بێدەنگ ڕاوەستن . ڕۆسلانیش شیعرەکەی ئەخوێندەوەو ئەیوت « دەشتەکە ، کێ وا پڕی کردووی لە ئێسکی مردوو ؟» سەیر ئەکەم وا دانیشتووەکان دایانە هارەی پێکەنین .. لە دڵی خۆما ئێکم دایەوە چییە بۆچی وا پێ ئەکەنن .. ئەبینم بە ئەسپەکە پێ ئەکەنن کە گوێی خۆی ئەلەقاند .

( کوردە ) بەرپەرچی قسەکانی ( کامەران )ی دایەوە ، وتی :

— ئەسپ کە گوێی شل کردبێ گوێچکە ئەلەقێنێ ..

— گوێی بۆچی شل کردبوو ؟

— گوێی بۆ شیعرەکە شل کردبوو ، ڕۆسلان شیعری ئەخوێندەوەو ئەویش گوێی بۆ ئەلەقاند ..

— ئەگەر هەر ئەوەندە بوایە چاروبار بیلەقاندایە قەیدی نەبوو ، بەڵام ئەو کردبووی بە باوەشێن .. ئەوەندە ئەیلەقاند ، ئەتوت مێش دەرئەکات .

( کوردە ) وتی :

— بەر لەمجارە تەمسیلم نەکردووە !

— باشە .. پێم نەوتی تا داوات لێ نەکەن نەچیتە سەر شانۆ ؟

زۆر خەفەتبار بووین . وامانئەزانی ( ئاواز ) خانیش دێ بەسەرمانا ، بەڵام ئەو هیچی نەوت . ئەگەر بەســەرمانا بهاتایە مەسەلەکە گەنتر ئەبوو ، چونکە ئێمە لە سنووری گوێ شــل کردنا نەمابووین . ڕەنگ بێ ئەو لە دڵی خۆیا وای لێك دابێتەوە من و ( کوردە ) کەڵکی چاك بوونمان پێوە نەماوەو بو ئەوە ناشێین کەس بەڕاستی قسەمان لەگەڵ بکا ..

بەهۆی تەمسیلەکەو بەهۆی شەترنج کردنەوە ، وا کە پێویست بوو ، نەکەوتمەوە کار .. کە پاش چەند ڕۆژێکیش لیستەی پلەکانی سێ مانگی یەکەمان وەرگرت ، ئەبینم لــە دەرزی ژمارەدا پلەی ( خراپ )م وەرگرتووە .

خۆم زۆر باش ئەمزانی پلەی ( خراپ ) وەرئەگرم . بەڵام لام وانەبوو بەم زووانە ئەم سێ مانگە دوایی دێ . بەتەمای ئەوە بووم وەختم ببێ پلەی خۆم ڕاست کەمەوە . کەچی ســێ مانگەکە بە زوویی بەسەرچوو . بۆم ڕێنەکەوت هەوڵێك بدەم . ( کوردە ) یش هەروەها پلەی (خراپ)ی وەرگرتبوو ، بەڵام لە دەرزی ڕووسیدا .

کە هاتینەوە بۆ ماڵ لە ڕێدا بە ( کوردە )م وت :

— بۆچی ڕاست بەر لە جەژن لیستەی پلەکانیان داینێ ؟ ئەمە هەموو شتێکمان لێ تێك ئەدا .

— بۆ ؟

— چونکە من ئەبێ پلەی ( خراپ )ەکەی خوم پیشانی باوكو دایکم بدەم !

— من بەر لە جەژن پیشانی دایکمی نادەم . نامەوێ جەژنەکەی لێ تێك بدەم ..

— ئەی پاش جەژن پیشانی ئەدەی ؟

— دیارە.. لە جەژنا هەموو کەسێ دڵێ خۆشە. ئەگەر بەر لە جەژن پلە (خراپ)ەکانی خۆمی پیشان بدەم دڵی هەموویان خەفەتبار ئەکەم. باشتر ئەوەیە خۆشیی جەژنەکەیان لێ نەشێوێنم. بۆچی لە خۆڕایی دڵی دایکم لە خۆم بێشێنم ؟! دایکمم زۆر خۆش ئەوێ ..

— ئەگەر خۆشت بویستایە باشت ئەخوێند.

— بۆ تۆ خۆت باش ئەخوێنی ؟

— من لەمەوپاش باش ئەخوێنم !

— منیش لەمەوپاش باش ئەخوێنم !

لێرەدا قسەکەمان دوایی هات. بڕیارمدا منیش چاو لە ( کوردە ) بکەمو تا پاش جەژن پلەکانی خۆم پیشانی دایکمو باوکم نەدەم. تا پاش جەژن نایدەمە دەستیان. چی تیایە ؟ قەید چی ئەکا ؟!

# بەشی هەشتەم

ئەمڕۆ ئەوڕۆژەیە کە بە دڵو دایەن چاوەڕوانی بووین . ئـەمڕۆ حەوتی تەشرینی دووهەمە ، جەژنی شۆڕشی مەزنی ئوکتۆبەرە .

بەیانی زوو لە خەو هەسـتام چوومە پەنجەرەکە ، هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو ، بەڵام دنیا ڕۆشن ببووبووەوە . ئاسمان شینو ، هیچ هەوری پێوە نەبوو . بە سەربانی هەموو ماڵێکەوە ئاڵای سـوور هەڵکرابوو . هەستم بە شادمانییەك کرد ئەوپەڕی نەبێ . وام‌ئەزانی ساڵی دوو بەهارە . نازانم بۆچی هەمیشە لەم ڕۆژەدا هەسـت بە شادمانی ئەکەمو ، لە بیرەوەریی خۆش بەولاوە هیچم تیا ناکەوێتە خەیاڵ ؟ من هەمیشە خەو بە شتی جوانەوە ئەبینم . حەز ئەکەم زوو گەورە ببمو ببم بـە پیاوێکی قارەمانی بەهێز هەموو جۆرە کارێکی شانازی پێوە کراو بکەم ، دارسـتانی چڕ ببڕمەوەو ، بە زەردومای سەختا هەڵگەڕێمو ، بە سواریی فڕۆکە جەرگی ئاسمان لەت‌کەمو ، بچمە ناو ناخی زەوی ئاسنو خەڵووزی بەرد بدۆزمەوەو ، کارێز لێدەم دەشـتو بیابانی پێ ئاو دەمو دارستانی پێ بنێژم . لە کارگەیەکدا ئیش بکەم چەند جۆرە مەکینەی تـازەی جوان دابێنم ..

ئاواتەخوازی ئەمەمو خەو بەمەوە ئەبینم . لایشـم‌وایە ئەمـە وەنەبێ شتێك بێ زۆر لە عادەت دوور بێ . باوکم ئەڵێ بنیادەمی وڵاتی ئێمە لە توانایا هەیە هەموو شتێ بکا هەر بـە مەرجێ‌خۆی بێ‌پەوێو باش بخوێنێو فێر ببێ .. ئەڵێ چونکە چەند ساڵێك

لەمەوبەر لە ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆدا ، لەم مانگەدا، سەرمایەدارەکانمان دەرکرد کە خوێنی گەلیان ئەمژیو ، گەل بوو بە خاوەنی هەمووشتێ .. ئەم قسەیەی باوکم وانەکەیەنێ ئیستا منیش خاوەنی هەموو شتێکم چونکە یەکێکم لە گەل .

لەم ڕۆژەدا باوکم سینەمایەکی دەستیو کۆمەڵێك وێنەی بە جەژنانە بۆ هێنام . دایکیشم جووتێ پێڵاوی خلیسکەی بۆ کڕیم . (لاولاو)ی خوشکیشم قوتبنمایەکی دامێ . منیش پاکەتێك بۆیەی وێنەکێشانم دا بە ( لاولاو ) . پاشان لەگەل باوکمو ( لاولاو ) چووین بۆ کارگەکەی باوکم ئیشی تیا ئەکا. لەوێشەوە لەگەڵ هەموو کرێکارەکان چووین بۆ خۆپیشاندانەکەی ڕۆژی جەژن . ئاوازەی مۆسیقا لە هەموولایەکەوە بەرز بووبووەوە . خەڵکەکە هەموو گۆرانییان ئەوت . منو ( لاولاو ) یش بە دڵێکی شادەوە گۆرانیمان ئەوت . باوکم یەکی فووکەرەیەکی بۆ کڕین . یەکێکی سوور بۆ منو یەکێکی سەوز بۆ ( لاولاو ) . بەرلەوەش بگەینە گەورەترین گۆڕەپانی شار یەکی ئالایەکی سووری بۆ کڕین . بە ئالاکانی دەستمانەوە بە بەردەمی سەکۆی نومایشەکەدا تێپەڕینو ئەمسەرو ئەوسەری گۆڕەپانەکە گەڕاین .

کە لێبووینەوە هاتینەوە بۆ ماڵ . میوان هاتن بۆ لامان . یەکەم کەس کە هات مامە ( شاسوار )م بوو . دوو قوتووی پێ بوو ، بە عەقڵ زانیم دیارییان تیایە بۆ منو ( لاولاو ) . بەلام مامە ( شاسوار ) بەرەلەوەی قوتووەکانمان بداتێ لێیپرسین ئاخۆ منالی ژیرو هێمنین . ئێمەیش وەلامان دایەوە :

— بەڵێ .

— ئەی بە قسەی دایکتان ئەکەن ؟

— بەڵێ باش بە قسەی ئەکەین .

— له قوتابخانه‌دا چۆنن ؟

(لاولاو) وتی :

— به ئاره‌زووی دلی تۆ .

منیش هه‌روه‌ها وتم :

— به ئاره‌زووی دلی تۆ .

جا ده‌ستـــی برد قوتوویه‌کیانی دامێ . که کردمه‌وه ئه‌بینم پارچه‌کانی مه‌کینه‌یه‌که ئه‌بێ خـۆم لێکیان بده‌م . قوتووه‌که‌ی تریشی دا به (لاولاو) . هینه‌که‌ی ئه‌ویش که‌ره‌سته‌ی ماڵه قوڵه‌ی تیابوو .

پووره (گه‌لاوێژ)و مامه (سه‌ربه‌ست)یشم هاتن . ئه‌نجا پووره (نـه‌مام)و مامه (هوشیار)و پاش ئه‌وانیش پووره (نازدار) هاتن . به هه‌موویانم وت له ده‌رسه‌کانما به ئاره‌زووی دلی ئێوه‌م . ئه‌وانیش سه‌رو دیاری‌یان دامێ ، بووم به خاوه‌نی کۆمه‌ڵێك دیاری . دانیشتم سه‌یری دیاری‌یه‌کانم بکه‌م ، ئه‌بینم وا نه‌ختـه نه‌ختـه دلم دائه‌گیرێ‌و خه‌فه‌تبار ئـه‌بم . له دلی خۆمـا رووزه‌رد ئه‌بووم که‌وا له ده‌رزی ژماره‌دا پله‌ی (خراپ)م وه‌رگرتووه‌و به‌وانم هه‌موو وتووه به ئاره‌زووی دلی ئێوه‌م .. زۆرم بیر کرده‌وه بۆ ئه‌وه‌ی جارێکی تـر شتێ وا روو نه‌داته‌وه . ســوێندم خوارد له‌مرۆ به‌دواوه زۆر باش بخوێنم‌و هه‌وڵ بده‌م تا جارێکی‌تر شـه‌رمه‌زار نه‌بم . که له دلی خۆما



ئه‌م‌بڕیاره‌م دا ، خه‌مه‌که‌ی دلم ورده ورده ره‌ویـــه‌وه‌و شادمانی‌ی

تێ کەوتەوە .

هەشتی مانگیش هەر جەژن بوو . چووم سەرم لە کەلێك لە هاوپۆلەکانم داو ئەوانیش کەلێکیان هاتن بۆلام . کەلێك یاریمان بە دیارییەکانی من کرد . ئێوارەش بە سینەما دەستی یەکەم کەلێك وێنەم پیشان دان . بەرلەوەش بنووم دیارییەکانی جەژنم لەسەر مێزێك لە نزیکی قەرەوێڵەکەمەوە ڕێك کرد . ( لاولاو )یش هێنەکانی خۆی ڕێك کرد . فووکەرەکانی دەستیشمان کە لەکاتی خۆپیشاندانەکەدا هەڵمان ئەدان ، بە بنمیچەکەوە بوون بەسەر سەرمانەوە . دیمەنێکی جوانیان هەبوو ، چاو لە تەماشا کردنیان تێر نەئەبوو .

سبەینێ کە لە خەو هەستام سەیر ئەکەم فووکەرەکان کەوتوونەتە خوارەوە ، چرچ بوون و بچووك بوونەتەوە . تومەز فوویان تیا نەماوە بۆیە ناچن بە ئاسمانا . کە لە قوتابخانە گەڕامەوە نەم ئەزانی چۆن باسی پلەی ( خراپ ) وەرگرتنەکەم بکێڕمەوە بۆ دایکم ، کەچی ئەو بیری کەوتەوەو داوای لێ کردم لیستەکەمی پیشاندەم . بێ ئەوەی هیچ بلێم دەرم هێنا بۆی لە جانتاکەم و دامە دەستی . دیار بوو کوتووپڕ نیشانەکەمی دی . ڕووی گرژ کرد و وتی :

— هەر ئەمزانی وائەبێ ! تۆ هەمیشە خەریکی یاری کردن و ڕابواردنی ، دیارە ئەبێ لە بەشی یەکەمی ساڵا پلەی وا وەربگری ، بەڵام بۆچی وایە ؟ چونکە قسەی منت هەرگیز بە گوێدا ناچێ . چەند جارم پێ وتی ئیشەکانت لەکاتی خۆیاندا جێ بەجێ بکە ، کەچی هەموو جاری وەك لەگەڵ دیوارەکەم بێ وابوە . لەوە ئەچێ بتەوێ لە پۆلی چوارەمدا بکەوی .

پێم وت لە ئیستا بەدواوە باش ئەخوێنم و ئیتر جارێکیتر پلەی ( خراپ ) وەرناگرم . بەڵام دایکم لەباتی ئەوەی هیچ بلێ

زەردەخەنەیەکی کاڵی کرد . تێگەیشتم کە باوەڕ بە گفتەکەم ناکا .
داوام لێ کرد لیستەکەم بۆ مۆر کا ، وتی :

— با باوکت مۆری کا بۆت !

هیچ نەماوە ئەمە نەبێ . بە تەمای ئەوە بووم ئـەم بۆم مۆر کاو ناچار ئەبم پیشانی باوکمی بدەم ، بەڵام وادیارە ئەبێ هەندێ قسەی تاڵ و سوێر لەویش ببیسم . ئەمە بەتەواوی هەستی دەروونمی گۆڕی ، هەتاوەکو وام لێهات نیازم. نەما ئیشەکانیشم جێبەجێ بکەم .

لە دڵی خۆما ئەموت : « تـا هەندێك نەیەت بەسـەرما هیچ ناکەم ! »

ئاخری باوکـم لـە کارگە گەڕایەوە . چاوەڕوانیم کـرد تا قاوەڵتی‌یەکەی ئەکا ، چونکە هەمیشە پاش قاوەڵتی دڵی خۆش‌و تەبیعەتی چاکە . کە لێبووەوە لیستەکەم لەسەر مێزەکە دانا لە بەردەمیـا ، گورج ناوەکەمی دی‌و سەیرێکی نیشانەکەمی کرد .

کە پلە ( خراپ ) ەکەمی دی ، وتی :

— ڕۆڵە ! فرکان فرکان ڕاتکرد بەدوایا تا گرتت.. شـوورەیی ناکەیت لە بەردەمی هاوڕێکانتا ؟!

وەڵامم دایەوە :

— خۆ تەنها من نیم !

— کێ‌ی‌تریش پلەی ( خراپ )ی وەرگرتووە ؟

— ( کوردە ) .

— جا بۆ ئەبێ تۆ چاو لە (کوردە) بکەی ؟ باشتر نی‌یە چاو لە یەکێ لە قوتابی‌یە باشەکان بکەی ؟ دڵت زۆر چووە بە ( کوردە )دا ؟

— نەوەڵڵا بابە !

— چاکتر ئەوەیە دەرزەکەت باش ڕەوان کەیو یارمەتی ی ئەویش بدەی . حەز ئەکەن هەردووکتان قەڵبترین قوتابی ی پۆلەکەتان بن ؟
— من هەرگیز حەز ناکەم وا بم‌و بڕیارم داوە لەمەولا لە جاران باشتر بخوێنم .
— پێشانیش ئەمەت وت !
— لەمەوبەر هەر وتن بوو ، بەڵام لەمەولا کردەوەشە !
— بزانین ئەمجارە ڕاست گفتەکەت ئەبەیتە سەر ؟
لیستەکەی بۆ دۆر کردم . لەوڕۆژە بەدواوە هیچی نەوت . زۆرم پێ ناخۆش بوو کەمێك نەهات بەسەرما . ڕەنگ بێ لە دڵی خۆیا وتبێتی ئەم کوڕە کەڵکی ئەوەی پێوە نەماوە سەری خۆمی پێوە بێشێنم‌و کاتی خوم بە قسەبە لەگەڵ کردنی بە خۆڕایی بدۆڕێنم ، مادەم هەمیشە هەر گفت ئەداو گفتەکانیشی نایاتە سەر . بەڵام من بڕیارمدا ئەمجارە بەڕاستم بێ‌و بەگوێرەی پێویست ئیش بکەم . داخەکەم ئەمڕۆ هیچ پرسیاریان لێ نەکردم ، لەو باوەڕەدا بووم ئەتوانم بە تەنها خۆم ڕاستی بکەمەوەو وەلامەکەی بزانم .
بۆ سبەینێ لە ( کوردە )م پرسی :
— دایکت لەسەر نیشانە ( خراپ ) ەکەت نەهات بەسەرتا ؟
— بەڵێ وەڵلا ، ئەویش‌و پوورە (زارا)ش تێروپڕیان پێ کردم . بەڵام باش‌بوو ئەم ئیتر قسەی نەکرد . هەر ئەیوت : « لەمەولا خۆم سەرپەرشتیت ئەکەم . ئەبێ لەمڕۆوە هەموو ئێوارەیەك ئیشەکانی قوتابخانەتم پیشان بدەی » دوو ڕۆژ سەیری کردو بۆ سەری سێهەم ڕۆژ ناوی خۆی لە تیپی تەمسیلدا نووسی . لەوڕۆژەوە تائیستا ئێواران نەمدیوەتەوە . ئەمڕۆ ئەیوت : « سبەینێ تەماشای ئەکەم » و سبەینێیش ئەی‌خستە دوو سبەی‌و هەر بەم‌جۆرە ... تا ڕۆژێکیان پێی‌وتم : « دەفتەرەکەتم بدەرێ بزانم چێت هەیە بۆ سبەینێ » ،

ئەو ڕۆژە خۆم هیچم نەکرد، چونکە خووەکەی ئەوم لەبیر چووبووەوە کە هەموو ئێوارەیەك ئەچوە دەرەوە، بۆ تیپەکەشی نەچوایە، ئەچوو بۆ شانۆ.

— مادەم دەرزی شانۆ ئەخوێنێ، ناچارە ئەبێ بچێ بۆ شانۆ.

— ئەزانم، بەڵام خۆ دایکیشم ئەخوێنێ، ئەشیەوێ خوێندنەکەی تەواو کاو باشیشی بزانێ. سەرەڕای ئەوە ئیشیش ئەکا، کەچی هەرگیز پێی نەوتووم: «لەمەولا من سەرپەرشتیت ئەکەم»، هەر ئەوەندە بوو ئەیوت: «ئەبێ بخوێنی». کە لۆمەیشی ئەکردم عاجز نەئەبووم لێی. بەڵام هەرگیز لە پوورە (زارا)م خۆش نابم. بنیادەم بیەوێ شتێك بکا، ئەیکاو‌کە نەیەوێ بیکا، نایکا. وادیارە من بۆیە خۆم هیچ ناکەم هەمیشە بەتەمای ئەوەم پوورم لەگەڵم خەریك بێ.. ڕەوشتی من وایە..

— لەجیاتی ئەوەی خەڵك تاوانبار بکەی، ئەبێ ڕەوشتی خۆت بگۆڕی.

— ئەی تۆ بۆ ڕەوشتی خۆت ناگۆڕی، خۆ تۆ وەنەبێ هیچ لە من باشتر بی!

— من ڕەوشتی خۆم ئەگۆڕم.

— منیش ئەیگۆڕم.

پاش چەند ڕۆژێك مامۆستای پەروەردە کردنی لەش مامۆستا (بەهزاد) ئاگاداری کردین کەوا هۆڵێك ئامادە کراوە بۆ وەرزشی باسکت بۆڵ، هەرکەس حەزی لێیەتی بڕوا ناوی خۆی بنووسێ. ئەمەمان زۆر پێ خۆش بوو، قوتابییەکان چوون ناوی خۆیانیان نووسی. منو (کوردە)یش حەزمان ئەکرد ناوی خۆمان بنووسین، بەڵام مامۆستا نەیهێشت، پێیوتین:

— باسکتبۆڵ تەنها بۆ ئەو قوتابییانەیە کە هەوڵ ئەدەن .

ئەم قسەیە دای لە دڵی ( کوردە ) . دەمێ بوو چاوەڕوانی ئەوەبوو بۆی هەڵکەوێ باسکتبۆڵ بکا ، کەچی ئەوا ڕێگای ئەوانیتر دراو ئێمە بێبەش کراین . بەڵام من ئەمەم زۆر پێ ناخۆش نەبوو چونکە بڕیارم دابوو هەرچۆن بووە هەوڵ بدەم بۆئەوەی لە تیپی یاریدا وەربگیرێم .

هەر ئەوڕۆژە ( ئاواز خان ) یش وتی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابییەکانو ، بەتایبەتی قوتابییەکانی تاقمی یەکەم تارادەیەك پێش‌کەوتوونو هیچ قوتابییەك نەماوە پلەی ( خراپ ) ی وەرگرتبێ تیایانداو تەنانەت تەنها دوانیان پلەی ( خراپ نییە ) یان وەرگرتووە . هەروەها وتی ئەگەر ئەمانەش ( خراپ نییە ) کەی خۆیان بگۆڕنو بیکەن بە ( چاك ) ئەوا گفتەکەی خۆیان ئەبەنەسەر . بەڵام باری تاقمەکەی ئێمە لە هی هەموان خراپتر بوو ، چونکە منو ( کوردە ) نیشانەی ( خراپ ) مان هەبوو .

( یاوەر ) وتی :

— سەیرکەن ! بەهۆی ئێوەوە ئێمەش کەوتووینەتە دواوە . ئەبێ لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوەو چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە .

( بەختیار ) پەنجەی ڕاکێشا بۆ منو ( کوردە )ی وتی :

— هەمیشە هەر ئەم دوانە خۆیانن . ئەوە شوورەییتان ناکرێ ؟ سەری هەموو پۆلەکەتان شۆڕ کردووە ؟ ئەوانیتر هەموو خەریکی هەوڵ دانن ، کەچی ئەمان لە هەموو لایەك دیارن ، حۆل حۆل ئەسووڕێنەوە ! ( شاخەوان ) ، تۆ بۆچی قوتابییەکی ئەوەندە بێکارەی ؟

هەر کە ( بەختیار ) ئەمەی وت ، هەموو قوتابییەکان ڕووی

دەمیان کرد، من :

— تۆ کەی تێئەگەی کە ئەبێ ببی بە قوتابی‌یەکی باش‌و هەوڵدەر !

پێم وتن :

— نازانم چیتـــان ئەوێ لێم ! مادەم من بڕیارم داوە بم بە قوتابی‌یەکی باش ، ئیتر پێویست بەم هەموو قسەیە چی‌یە ؟

( پشکۆ ) لێی‌پرسیم :

— بڕیارت داوە ! بەڵام ئەی نیشانەکانت ؟

— نیشانەکانم نیشانەی ئەوسامن .. من دوو ڕۆژە بڕیارم داوە .

— ئەڵێی‌چی ؟ ئەی زووتر بۆ بڕیارت نەدا ؟

( ئاواز خان ) هاتە جواب‌و وتی :

— نەء ، کوڕەکانم . نابێ بچن بەگژی یەکدا ، ئەبێ لەناو خۆتانا یارمەتی‌ی دواکەوتووەکانتان بدەن ، ئەبێ دوان لە خۆتان هەڵبژێرن بۆ یارمەتی‌ی ( کوردە )و ( شاخەوان ) ..

( ئازاد ) پرسی :

— ڕێگام ئەدەن من یارمەتی‌ی ( شاخەوان ) بدەم ؟

( پشکۆ ) یش وتی :

— منیش یارمەتی‌ی ( کوردە ) ئەدەم . ئیزنم ئەدەن ؟

( ئاواز خان ) وەڵامی دانەوە :

— بێ‌گومان . شتی چاکە ئێوە خۆتان داوا ئەکەن یارمەتی‌ی هاوڕێکانتان بدەن ، بەڵام ئەبێ ئەمان خۆیان هەوڵ‌و تەقەلایان زیاتر بکەن . ( شاخەوان ) لام‌وایە تۆ هەر کە نەت‌توانی وەڵامی پرسیارێك بدەیتەوە کورج پەنا ئەبەیتە بەر باوك‌و دایکت , لەوان

ئەپرسی ، وا نی‌یە ؟

— نەخەیر ، من ئیستا هیچ لە باوکم ناپرسم . نامەوێ لەکاتی ئیشا سەری لێ بشێوێنم . . کـــە شتێکم نەزانی لە یەکێك لە برادەران ئەپرسم .

— فەرقی چی‌یە ؟ من ئەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم خۆت بە خۆت ئیش بکە . ئەگەر وەختی پێویست بۆ پیاچـوونەوەو لێکدانەوەی دەرزەکانت تەرخان بکەی ، باش بیری لێ بکەیتـەوە ، بێ‌گومانم ڕەوانی ئەکەی . بەڵام ئەگەر هەموو جارێ یەکێك ئیشەکانت بۆ بکا ، دیارە هەرگیز فێری هیچ نابی . کـــە پرسیارت ئەدەنێ بۆ ئەوەت ئەدەنێ فێر ببی خۆت بیر بکەیتەوە .

— باشە . لە ئیستا بەدواوە خۆم ئیشەکانی خۆم ئەکەم .

— ئاوا ! هەوڵ بدە ، هەول . جا ئەگەر زانیت بە هیچ جۆرێ ناتوانی لێکی بدەیتەوە قەیدی نی‌یە برۆ داوا لە یەکێ لە هاوڕێکانت بکە یارمەتیت بدا . بەڵام ، ها ! تا ناچار نەبی نەڕۆی !

— نەء ، وائەزانم خۆم ئەتوانم لێکی بدەمەوە . ئەگەر نەمزانی ئەوجا ئەچم لە ( ئازاد ) ئەپرسم .

— ئەگەر بتەوێ ئەتوانی خۆت لێکی‌بدەیتەوە .

# بەشی نۆهەم

هەر کە گەڕامەوە بۆ ماڵ دەسم کرد بە ئیش . هەستم کرد هەموو گیانم پڕ بووە لە عەزمێکی بەتین ، ئەمە بەڕاستی سەرسامی کردم . بۆئەوەی دەس پێ بکەم ، ویستم لە ناڕەحەت‌ترین دەرزەوە تێهەڵچم وەك ( ئاواز خان )ی مامۆستامان پێی‌وتبووم‌و ئامۆژگاری‌ی کردبووم . جا پاش ئەوە وردە وردە دێمە سەر دەرزە ئاسانەکان . ئەو ڕۆژە پرسیارێکم درابوویە ، ئەبوو لێکی‌دەمەوە . دەفتەرەکەم خوێندەوە :

« کۆگایەکی بازرگانی ( ٨ ) مشارو سێ ئەوەندە تەوری تیایە . نیوەی تەورەکان‌و (٣) مشاری فرۆشرا بە چەند دارتاشێك بە (٨٤) ڕۆبڵ . ئەویشی فرۆشــرا بە ( ١٠٠ ) ڕۆبڵ . بزانە نرخی هەر تەورێك‌و هەر مشارێك چەندە ؟ »

لەپێشا هیچی لێ تێنەگەیشتم . جارێکی‌تریش ، دوو جاری‌تریش خوێندمەوە . جا وردە وردە حاڵی بووم . ئەوانەی ئەم پرسیارانە ڕێك‌ئەخەن لە خۆیانەوە ئەی‌ئاڵۆزکێنن بۆئەوەی قوتابی نەتوانێ گورج لێکی بداتەوە . نووسیویانە « کۆگاکە (٨) مشارو سێ ئەوەندە تەوری تیایە » دە باشە بۆ ڕاست ناڵێن (٢٤) تەوری تیایە ؟ دیارە ئەگەر ( ٨ ) مشارو سێ ئەوەندە تەوری تیابێ ئەکاتە ( ٢٤ ) تەور ، ئیتر ئەم گرێ کوێرەیەی بۆچی‌یە ؟ هەروەها سەرەکەی‌تریشی :« نیوەی تەورەکان‌و (٣) مشاری لێ فرۆشــرا بە چەند دارتاشێك بە (٨٤)

ڕۆبڵ » دە بۆ ڕاستو ڕەوان نالێین (١٢) تەوری لێ فرۆشرا ؟ وەك
ئەی شتەکە ئاشکرا نەبێ . مادەم تەورەکان (٢٤) بن ، دیارە
بیوەیان ئەکاتە (١٢)و ئەمە گشتی فرۆشراوە بە (٨٤) ڕۆبڵ . ئەنجا
ئەڵێن « ئەویشی فرۆشرا بە (١٠٠) ڕۆبڵ » . ئەویشسی ا بۆ وەك
بنیادەم قسە ناکەن . تەورەکان هەموو (٢٤) تەورن (١٢) یان
فرۆشراوە ، دیارە (١٢)یان ماوە . مشارەکانیش ! پێشان (٨) مشار
بون (٣)یان فرۆشران بە تاقمێك دارتاش ، دیارە ئەوەی‌تری کە
پاشان فرۆشرا (٥) مشارە . شتەکە ئاشکرایەو لەمە زیاتر هیچ
نی‌یە بیڵێین . بەڵام ، نەء ! بە دەسەنقەست مەسەلەکە ئەئاڵۆزکێنن ،
جا بە ئێمەش ئەڵێن کەرو نەفامن‌و پرسیاریان بۆ لێك نادرێتەوە .
بە شێوە ئاسانەکەی خۆم پرسیارەکەم نووسی‌یەوە ، تا زووترو
ڕەحەت‌تر بتوانم لێکی دەمەوە . لای خۆم ئاوەهای لێ دەرچوو :
« کۆگایەکی بازرگانی (٨) مشارو (٢٤) تەوری تیایە ، (١٢)
تەورو (٣) مشاری فرۆشرا بە تاقمێك دارتاش بە (٨٤) ڕۆبڵ ،
(١٢) تەورەکەی‌ترو ئەو (٥) مشارەکەشی فرۆشرا بە (١٠٠) ڕۆبڵ .
کەواتە نرخی هەر تەورێك‌و هەر مشارێك چەندە ؟ » .
کە بەم شێوەی خۆمە نووسیمەوە ، جارێکی‌تر خوێندمەوە . دیم
کەمێك لە پرسیاری پێشوو کورت‌ترە . بەڵام ڕێگای لە جاران
چاکترم نەئەزانی بۆ لێکدانەوەی . ژمارەی تەورو مشارەکان لە
مێشکما تێك‌ئەچوون‌و نەیان‌ئەهێشت بیر بکەمەوە . ئەبێ کورت‌تری
کەمەوە تا ژمارەکان کەم بینەوە . ئەوەی بۆچی‌یە مادەم هەموو
تەورو مشارەکان فرۆشران ، بڵێین کۆگاکە چەندی تیا بووە ؟
کورتم کردەوە ، ئا وای لێ دەرچوو :
« (١٢) تەورو (٣) مشار فرۆشرا بە (٨٤) ڕۆبڵ ، (١٢) تەورو

(٥) مشاریش فرۆشرا بە (١٠٠) ڕۆبڵ .کەواتە نرخی هەر تەورێك‌و هەر مشارێك چەندە ؟ » .

ئەمجارە پرسیارەکە کورت‌تر بووەوە ، بەڵام چۆن لەمەشــی کورت‌تر کەمەوە ؟ ئێمە ئەوەمان مەبەست نی‌یە بزانین تەورو مشار بە کێ فرۆشراوە . تەنها ئەوەندەمان ئەوێ بزانین چەند تەورو چەند مشار فرۆشراوە .. بیرم کردەوە .. بیرم کردەوە .. تا گەیشتمە ئەوە کە پرسیارەکە بەم‌جۆرە داڕێژمەوە :

« (١٢) تەورو (٣) مشار بە (٨٤) ڕۆبڵ

« (١٢) تەورو (٥) مشار بە (١٠٠) ڕۆبڵ

« نرخی هەر مشارێك‌و هەر تەورێك چەندە ؟ »



لە توانامدا نەما لەوە کورت‌تری کەمەوە . ئەمجا با بزانین چۆن لێك ئەدرێتەوە ، کە (١٢) تەورو (٣) مشار بە (٨٤) ڕۆبڵ بێ ، با هەموو تەورو مشارەکان بخەینە سەر یەك‌و (٨٤) ەکەیان بەسەردا دابەش کەین . (١٢)م خستە سەر (٣) کردیە (١٥) ، ئەنجا (٨٤)م بەســەردا بەش کرد ، ئەبینم دەری ناهێنێ چونکە لێی‌ئەمێنێتەوە . هاتم (٢٤) تەورەکەو (٨) مشارەکەم هێناو خستمنە ســەر یەك‌و ڕۆبڵەکانیشم کۆکردەوەو دابەشـم‌کردن بەسەر هەموو تەورو مشارەکاندا ، ئەمیش هەر نەی‌هێنا . باشە .. مشارەکانم لە تەورەکان دەرکردو پارەکەم بەسەر فەرقی نێوانیاندا دابەش کرد ، ئەمەش

هیچی لێ پەیدا نەبوو . ئەنجا ویستم تەورەکان‌و مشـارەکان بخەمە سەر یەك‌و تەورەکان لە پارەکە دەرکەم و فەرقەکەی نێوانیشیان دابەش کەم بەسەر مشارەکانا .. ئەمەیانم تائێستا نەکردووە ، بەڵام دیارە هیچی لێ ناوەشێتەوە ! ناچار پرسیارەکەم هەڵگرت‌و چووم بۆ لای ( ئازاد ) ، پێم‌وت :

— پێم بڵێ : (١٢) تەورو (٣) مشـار بە (٨٤) ڕۆبڵ . (١٢) تەوری‌ترو (٥) مشاریش بە ١٠٠ ڕۆبڵ . ئەم‌مەسەلەیە ئەبێ چۆن لێك‌بدرێتەوە ؟

— تۆ لات‌وایە چۆنە ؟

— من لام‌وایە ئەبێ (١٢) کە بخەینە سـەر (٣)و (٨٤) بەسەر (١٥)دا دابەش‌کەین .

— بۆ ئەتەوێ ژمارەی تەورو مشارەکان بخەیتە سەر یەك ؟

— تا بزانین هەمووی چەندەو پارەکەیان بەسەرا دابەش‌کەین ، بزانین یەکی چەندیان ئەکەوێ ؟

— یەکی لە کام : لە مشارەکان ، یا لە تەورەکان ؟

— لە هەردوکیان .

— کەواتە نرخی هەردوکیان وەك یەکە .

— ئەی بۆچی وەك یەك نی‌یە ؟

— لەبەرئەوە کە پرسیارەکە وا ناڵێ . ئێمە پێچەوانەی ئەمەمان ئەوێ ، ئەمانەوێ بزانین تەور بە چەندەو مشار بە چەندە . کەواتە ناتوانین بی‌یان‌خەینە سەر یەك .

— وەك ئەزانی ، بی‌یان‌خەیتە سەر یەك‌و نەیان‌خەیتە سەریەك ، چون یەکە ، هیچیان لێ دەرناچێ .

— ئاخر بۆیە هیچت بۆ ڕاست نەبوەتەوە .

— ئەی ئەبێ چی بکەم ؟

— بۆ خۆت بیر بکەرەوە .

— دوو سەعات بیرم کردووەتەوە .

— سرنجی پرسیارەکە بدە بزانە چی تیا ئەبینی ؟

— ئەوەی تیا ئەبینم ئەڵێ (١٢) تەورو (٣) مشـــار بە (٨٤) ڕۆبڵ ، (١٢) تەوریترو (٥) مشاریش بە (١٠٠) ڕۆبڵ .

— باشە ، سرنج نادەی لە هەردوو مامەڵەکەدا ژمارەی تەورەکان ئەوەندەی یەکن و ، لە دووهەمیانا مشارەکان دوانیان زیادە ؟

— بـا .

— ئەی سرنج نادەی لە دووهەمیانا (١٦) ڕۆبڵ زیاتر دراوە ؟

— بەڵێ ، لە مامەڵەی یەکەمـــدا (٨٤) ڕۆبڵو ، لە مامەڵەی دووهەما (١٠٠) ڕۆبڵ دراوە ، (٨٤) لە (١٠٠) دەرکە (١٦)ی ئەمێنێتەوە .

— کەواتە بۆچی لە مامەڵەی دووهەمـــدا (١٦) ڕۆبڵ زیاتر دراوە ؟

— ئاسانە ! (٢) مشـــاری زیادە کڕراوە ، ئەو (١٦) ڕۆبڵە زیادەیە بۆ ئەو (٢) مشارە دراوە .

— کەواتە ئەو (١٦) ڕۆبڵە نرخی ئەو (٢) مشارەیە ؟

— دیارە .

— کەوابوو هەر مشاری بە چەندە ؟

— ئەگەر (٢) مشار بە (١٦) ڕۆبڵ بێ ، دیارە مشارێك بە (٨) ڕۆبڵە .

— کەواتە نرخی مشارەکەت زانی ؟

ئەمە چی‌یە ؟ خۆ زۆر ئاسانە ! چۆن بەتەنها خۆم لێکم نەدایەوە !
— چاوەڕوان بە ! ئەبێ بزانی تەورەکانیش دانەیان بە چەندە .
— تازە شتەکە گران نی‌یە . (١٢) تەورو (٣) مشـار بە (٨٤) ڕۆبڵ ، (٣) مشارەکە بە (٢٤) ڕۆبڵ . (٢٤) لە (٨٤) دەرچێ (٦٠)ی ئەمێنێتەوە . کەواتە (١٢) تەور بە (٦٠) ڕۆبڵە ، نرخی هەر تەورێك ئەوەندەی بەشێکە لە (٦٠) کە دابەش بکرێ بەسـەر (١٢)دا ، واتە (٥) ڕۆبڵ .
کە ئەگـەڕامەوە بۆ مـاڵ دڵم خەمگین بوو ، بۆچی نەمتوانی خۆم پرسیارەکە لێك‌بدەمەوە . سوێندم خوارد ئەبێ بۆ جاری داهاتوو خۆم لێکی‌دەمەوە با (٥) سەعاتیشی پێوە خەریك بم .
سبەینێ دەرزی ژمارەمان نەبوو ، زۆرم پێ خۆش بوو ، چونکە وەنەبێ لێکـدانەوەی ژمارە شتێکی خۆش بێ . لە دڵی خۆما ئەم‌وت :
— « هیچ نەبێ ڕۆژێك بە بێ دەرزی ژمـارە ئەحەسێمەوە » بەڵام وام بۆ نەهات کـە بە تەما بووم . خەریکی لێکدانەوەی دەرزەکانم بووم (لاولاو)هاتە سەرم پێی‌وتم :
— ( شاخەوان ! ) پرسیارێکیان داومەتێ ، نەمتوانیوە لێکی بدەمەوە . یارمەتیم بدە تیایدا .
— سرنجێکی پرسیارەکەم دا ، لە دڵی خۆمدا وتم :
— بەزمێکی ناخۆش نابێ ئەگەر نەزانم لێکی‌دەمەوە . دەسەڵاتم هیچ بەسەر (لاولاو) دا نامێنێ‌و قسەم بێ قیمەت ئەبێ لای .
پێم‌وت :
— جارێ پێم ناکرێ . کۆمەڵێك ئیشم کەوتووە بەسەرا ئەبێ

تەواویان کەم. ئیستا بڕۆ بۆ یاری کردن ، پاش دوو سەعاتێك وەرەوە یاریدەت ئەدەم .
لە دلی خۆما وتم :
— « کە ئەو ڕۆیی بیری لێ ئەکەمەوەو پاشان بۆی لێك ئەدەمەوە » .
( لاولاو ) وتی :
— من ئیستا ئەڕۆم بۆلای ئاوەلەکەم .
— بڕۆ ، بەلام زوو نەیەیتەوە . ئەتوانی دوو سەعات ، بەلکو سێ سەعاتیش یاری بکەی لەگەلی ، ئەوجا بێیتەوە . چەند ئارەزوو ئەکەی بمێنەرەوە .
(لاولاو) ڕۆیی . منیش کتێبەکەم گرت بەدەستەوەو پرسیارەکەم خوێندەوە :
« کوڕێكو کچێك چوون بۆ ناوباخ بۆ گوێز چنینەوە ، بە هەردووکیانەوە (١٢٠) گوێزیان چنیەوە . گوێزەکانی کچەکە دوو قات کەمتر بوون لە گوێزەکانی کوڕەکە . ئەبێ هەریەکی چەندیان چنیبێتەوە ؟ »
پێکەنینم بە پرسیارەکە هات .. لە دلی خۆما وتم تۆ باسی پرسیار ئەکەیت ، کەچی ئەمەی هێناوتە هیچ لێکۆلینەوەی ناوێ . مەسەلەکە هیچ زەحمەت نی‌یە . هیچمان ناوێ ئەوە نەبێ ( ١٢٠ ) دابەش کەین بەسەر (٢)دا جا یەکی(٦٠)یان ئەکەوێ . کەواتە کچەکە (٦٠) گوێزی چنیوەتەوە . ئەی کوڕەکە چەندی چنیوەتەوە؟ ١٢٠ ـ ٦٠ = ٦٠
ئای ! وانابێ ، ئەمە وائەکەیەنێ هەرکامیان ئەوەندەی ئەویانیانی چنیوەتەوە ، کەچی لە پرسیارەکەدا ئەلێ کچەکە دوو قات لە کوڕەکە کەمتری چنیوەتەوە . ئای ! ئای ! هەلم‌هێنا ! ئەبێ ( ٦٠ )



دابەش کەین بەسەر (۲)دا کە یەکی (۳۰) یان ئەکەوێ . کەواتە کوڕەکە (٦۰)و کچەکە (۳۰)ی چنیوەتەوە . سەیرێکی وەڵامی پرسیارەکەشم کرد لە کتێبەکەدا . ئەبینم ئەڵێ کوڕەکە (۸۰)و کچەکە (٤۰)ی چنیوەتەوە .

لە دڵی خۆما وتم :

— بیر کەرەوە ! چۆن وائەبێ ؟ لای من (۳۰) بە (٦۰) بوو ، کەچی ئەبێ (٤۰) بە ( ۸۰ ) بێ . با کەمێ لێی ورد ببمەوە . بە هەردوکیانەوە (۱۲۰) گوێزیان چنیوەتەوە ، ئەگەر کوڕەکە ( ٦۰ )و کچەکە (۳۰)ی چنیبێتەوە هەمووی ئەکاتە (۹۰). کەواتە وەڵامی ڕاست ئەمە نی یە . جارێکی‌تر دەسم کرد بە لێکدانەوە ، دیسان هەر ئەنجامەکەی (۳۰) بە (٦۰) بوو ! ئەی ئەوان چۆن (٤۰) بە (۸۰)یان داناوە ؟ دیارە ئەبێ موعجیزەیەك لە مەسەلەکەدا ببێ ..

ئای لەم کچانەی پۆلی سێ ! پرسیاری‌وایان ئەدرێتێ کوڕی پۆلی چوار بۆی ساغ ناکرێتەوە !.. نازانم ئەوان چۆنیان بۆ ساغ ئەکرێتەوەو سەریان لێ دەرئەچێ .. ئای بەدبەختینە !.

کەوتمەوە بیر کردنەوە .. شوورەیی یە بۆم نەیزانم . ئەوجا (لاولاو) پێم ئەڵێ : « قوتابی‌ی پۆلی چوار پرسیاری پۆلی سێ‌ی بۆ لێك‌نادرێتەوە » . توندتر بیرم کردەوە ، هیچ کەڵکی نەبوو..

وا شەو داهات ، چار چی‌یە ؟ پرسیارەکە ئەڵێ گوێزەکە هەمووی (١٢٠) گوێزەو ئەبێ وا دابەش کرێ یەکێکیان دوو ئەوەندەی ئەویانی بەرکەوێ . ئەگەر ژمارەیەکی‌تر بوایە لەوانەبوو شتێکی لێ هەڵکرێنم ، بەڵام لەمدا بێهوودە هەوڵم ئەدا (١٢٠) دابەش کەم بەسەر (٢) داو ، (٢) لە (١٢٠) دەرکەمو ، (١٢٠) بدەم لە (٢) . بە هیچ جۆرێ نەئەگەیشتمە (٤٠) بە (٨٠) ..

دەسم لەوە داشۆردبوو وەڵامەکەی بدۆزمەوە ، هاتم وێنەی درەختێکم لەسەر دەفتەرەکەم کرد ، کورو کچێك لەژێریا وەستابوون ، درەختەکە (١٢٠) گوێزی پێوەبوو ، یەك لەدوای یەك وێنەی گوێزەکانیشم کێشا . لە کۆڕی وێنە کێشانەکەشا بیرم ئەکردەوە ، بەڵام ڕێی بیرم نەئەگەوتە سەر وەڵامی ڕاست .. لەپێشا لە دڵی خۆما پرسیم بۆچی ئەبێ کورەکە دوو ئەوەندی کچەکەی چنیبێتەوە ؟ دیارە ئەبێ ئەو سەرکەوتبێتە سەر دارەکەو ئەم لە خوارەوە چنیبێتیەوە . ئەگەر وابێ ئەم کەمتری دەس ئەکەوێ .. ئەنجا هاتم بە دەستی خۆم گوێزەکانم لە دارەکە ئەکردەوەو ئەمدا بە کورو کچەکە ، واتە بە خەت کوژێن ئەم کوژاندەوە بە درەختەکەوەو بەسەر سەری کورو کچەکەوە وێنەیم ئەکێشایەوە . پاشان لە دڵی خۆما وتم باشتر ئەوەیە بیکەمە گیرفانیان . کورەکە چاکەتی لەبەرا بوو ، دوو گیرفانم بۆ کرد ، گیرفانێك لای ڕاست‌و گیرفانێك لای چەپ . گیرفانێکیشم بۆ فستانی کچەکە کرد . ڕەنگ‌بێ کچەکە بۆیە کەمی چنیبێتەوە چونکە یەك گیرفانی هەبوو . چاوم تێبڕین : کورە بە هەردوو گیرفانیەوەو کچە بە تاقە گیرفانێکەوە . مەسەلەکەم کەمێك بۆ ڕۆشن بووەوە . وێنەی گوێزەکانم بەسەر سەریانەوە کوژاندەوەو وێنەی گیرفانەکانیانم کێشایەوە بە هەڵاوساوی ، وەك بڵێی پڕ بن لە

گوێز ! ئیستا دیاره (١٢٠) گوێزەکە لە (٣) گیرفاندایە ، دوو گیرفانەکەی کوڕەکەو تاقە گیرفانەکەی کچەکە کە هەمووی ئەکاتە (٣) گیرفان . هەر لەوکاتەدا کوتووپڕ بە خەیالما هات (١٢٠) گوێزەکە بکەم بە سێ بەشەوە ، کچەکە بەشێکی بەرێ‌و کوڕەکە ئەو دوو بەشەکەی . بەمجۆرە کوڕە دوو ئەوەندەی کچەکەی بەرئەکەوێ . (١٢٠) م بەسەر (٣) دا دابەش‌کرد یەکی (٤٠)یان کەوت . کەواتە بەشێکیان ئەکاتە (٤٠)و ئەو دووبەشەکەیان ئەکەنە (٨٠) . دەق وەك لە وەلامی ناو کتێبەکەدا نووسراوە . لە خۆشی‌یاندا وختبوو بال بکرمەوە . ڕامکرد بۆلای ( ئازاد ) بۆی بکێڕمەوە چونم کرد تا پرسیارەکەم لێکدایەوە .

بە شەقاما ڕام‌ئەکرد ، ( کوردە)م دی ، پێم‌وت :

— (کوردە) .. گوێ بگرە ! کوڕێك‌و کچێك چوون بۆ ناوباخ بۆ گوێز چنینەوە ، (١٢٠) گوێزیان چنی‌یەوە ، کوڕەکە دوو ئەوەندەی کچەکەی برد . بە عەقلی تۆ ئەبێ یەکی چەندیان بردبێ ؟

— بە عەقلی من ئەبێ ئەو کوڕە تێر فەلاقە بکرێ تا فێر ببێ لەگەل کچان باش بجوولێتەوە .

— باسم لەوە نی‌یە . ئەبێ گوێزەکە چون دابەش‌کرێ لەنێوانیانا تا کوڕەکە دوو ئەوەندەی کچەکەی بەرکەوێ

— باشە ، با بە ئارەزووی خۆیان بەشی‌کەن . تو بۆ خۆتی تێ‌هەل‌ئەقورتێنی ؟ با بیکەن بە دوو کەرتەوە .

— بەلام لە پرسیارەکەدا وا ناکرێ .

— پرسیاری چی ، کام پرسیار ؟

— پرسیاری ژمارە .

— لە کۆلم بەرەوە . من بەرازێکی هێنـدیم بوو ، پێرەکە

کرییووم ، ئەمرۆ تۆیی ، کەچی تۆیش هاتوویت سەرو دلم ئەوەندەی‌تر بە پرسیار کردن بگری .

پێم‌وت :

— بمبوورە . نەمزانی عازیەتی باری .

ڕام‌کرد تا چوومە لای ( ئازاد ) :

— ئەزانی ؟ پرسیارێك هەیە ، پیاوی زیرەك نەبێ ناتوانێ وەڵامی بداتەوە : کوڕێك‌و کچێك (١٢٠) گوێزیان چنیەوە . کوڕەکە دوو ئەوەندەی کچەکەی برد . ئەبێ بکرێ بە سێ بەشەوە ، وانی‌یە ؟

— با ، وایە . کچەکە بەشێك‌و کوڕەکە دوو بەش . بەم‌جۆرە بەشی کوڕەکە دوو ئەوەندەی بەشێ کچەکە ئەبێ .

— هەر خۆم لێکم‌دایەوە . پرسیاری ئاڵۆزی‌وا ڕێك‌ئەخەن تا بنیادەم نەتوانێ لێکی‌بداتەوە ، بەڵام من لێکم‌دایەوە ..

— تۆ ؟ تۆ بلیمەتی بلیمەت ! .

— من ئیستا هەر خۆم پرسیارەکانم لێك‌ئەدەمەوە .

— هەول بدە هەمیشە خۆت لێکیان بدەیتەوە . وا باشترە ، چاکتر فێر ئەبێ .

گەڕامەوە بۆ ماڵ ، لە ڕێدا تووشی ( یاوەر ) بووم ، پێم‌وت :

— ( یاوەر ) پێم‌بلێ : کوڕێك‌و کچێك چوون بۆ ناوباخ بۆ گوێز چنینەوە ..

— گوێز بچێ بە چاڵی چاوتا . ئەوە باشتر نی‌یە پێم بلێی بۆچی خەریکی دەرزەکانت نیت ؟

— بە شەرەفم لە گەرمەی خەریکیدام !

— باشە . بەڵام تۆو ( کوردە ) ی هاوڕێت هەموو پۆلەکەتان دواخستووە ..

— بە شـەرەفم من ئیش ئـەکەم . ( کوردە )یش بەرازە هێندی‌یەکەی تۆپیوە . ئەی تۆ بۆ کوێ ئەڕۆی ؟

— بۆ ماڵی ئێوە ئەهـاتم بزانم خەریکی چیت . ئەبینم وا لە ماڵ نیت ، لەمەوپاش سەیر ئەکەم بزانم ئیشەکانت چۆن جێ‌بەجێ ئەکەی .

— باوەڕم پێ بکە ئەمڕۆ پرسیارێکم لێکدایەوەو وەڵامی ڕاستی ئەو پرسیارەم دۆزی‌یەوە . دەقیقەیەکە لە ماڵ هاتوومەدەر بچم بۆ ( ئازاد ) ی بکێڕمەوە . وەرە بڕۆین بۆ ماڵی خۆمان لـەوێ پیشانت دەم .

بردم بۆ ماڵی خۆمانو پرسیاری کوڕو کچەکەم پیشاندا .

( یاوەر ) بە سەرسامی‌یەکەوە وتی :

— ئەمە پرسیاری پۆلی سێ‌یە .

— بڕیارم داوە تەماشای پرسیارەکانی پار بکەمەوە ، چونکە لە ژمارەدا باش نیمو ئەبێ بگەمەوە بە ئاوەڵەکانم .

— بڕیارێکی چاکت داوە . ئەگەر ئەوەی پێشان خوێندوومانە چاکی بزانی باشتر دەرزەکانی ئەمساڵیشت تێ‌ئەگەی .

(یاوەر) ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان . ( لاولاو ) گەڕایەوە . دەسم کرد بە لێکدانەوەی پرسیارەکە بۆی . وێنەی درەختێکم بۆ کێشا بە گوێزەکانەوە ، وێنەی کوڕێکیشم کێشـا بە دوو گیرفانو کچێك بە یەك گیرفانەوە .

( لاولاو ) وتی :

— چەند جوانی لێك‌ئەدەیتەوە . ئەگەر تۆ نەبوویتایە بە تەنیا خۆم بۆم لێك‌نەئەدرایەوە .

— پرسیارەکەت ئاسانە. کە پێویستت بە شتێ بوو پێم‌بڵێ ، بە دوو دەقیقە بۆت لێک‌ئەدەمەوە ..

بەم‌چەشنە کوتووپڕ بووم بە کوڕێکی‌تر .. پێشان داوای یارمەتیم لە خەڵك ئەکرد ، وا ئیستە وام لێ‌هاتووە خەڵك فێـــر ئەکەم ، کەچی پلەیشم لە دەرزی ژمارەدا (خراپ) ە .

# بەشی دەهەم



سبەینێ کە لە خەو هەڵسام ، لە پەنجەرەکەوە سەیرم کرد ئەبینم وا زستان هاتووەو بەفر باریوە ، دنیا سپی ئەکاتەوە ، سەربانو ناوجادە هەموو تارای زیوینی پۆشیوە . درەختەکان لە دوورەوە ئەتوت دانتێلیان پیا کراوە ، بەفر بەسەر لقو پۆپەکانیانەوە کەڵەکەی کردبوو .

هات بە دڵما پێڵاوی خلیسکەکەم تاقی کەمەوە کە دایکم لە جەژنانەدا دایمێ ، بەڵام ئەبوو پێشان بچم بۆ قوتابخانە . ئیشو کارەکانی قوتابخانەم جێبەجێ کردو کتێبەکەی ( لاولاو )م بەدەستەوە گرت ، چەند پرسیارێکم لێکدایەوە . بڕیارم دابوو هەموو پرسیارەکانی پۆلی سێ لێکدەمەوە . هەندێکیان ئاسان بوون وەك با بەسەریانا تێئەپەڕیم ، بەڵام جاروباریش هەندێ پرسیاری قورسیوام ئەهاتە ڕێ لەوانە بوون سەرم سپی بکەن ! ئەوەندە هەبوو وەك جاران نەئەترسامو ڕێگای خۆمم نەئەدا بەرلەوەی ئەو مەسەلە گرانەی دێتە ڕێم لێکی بدەمەوە ـ باز بەرم بۆ مەسەلەیەکی تر . ئۆی ! پرسیارەکانم هەموو لە ڕۆژێکا پێ لێك نەدرانەوە ، دوو هەفتە سێ هەفتەیان خایاند . تا پاش خۆراواو تاریك داهاتن خلیسکەم نەئەکرد بەسەر

بەفرا . کە لە لێکدانەوەی هەموو پرسیارەکانی پۆلی سێ بوومەوە
وام لێهات لە جاران چاکتر لە دەرزی ژمارە ئەگەیشتم ، هەتاوەکو
ئەو پرسیارانەش کە ( ئاواز خان ) پێمی ئەدان بە بێ یارمەتی ی
کەس لێکم ئەدانەوە . کە لێ ئەبوومەوە ئەمبینی گەلێکیان لە
پرسیارەکانی پۆلی سێ ئەچوون ، بەڵام لەوان ئاڵۆزتر بوون ، لەگەڵ
ئەوەشدا بۆ خۆم لێکم ئەدانەوە . ئەمە گەلێك لە لێکدانەوەی پرسیارە
سادەکان زیاتر دڵی خۆش ئەکردم . ئیتر لەوە دەرچووم لە
ژمارە بترسم ، بارێکی قورس بەسەرشانمەوە لاچوو ، ژیان جوانترو
ئاسانتر بوو لام . ( ئاواز خان ) گەلێك پێ خۆشحاڵ بوو بەم
پێشکەوتنەم . پلەی بەرزی ئەدامێو ، هاورێیان وەك جاران
نەئەهاتن بەسەرما . باوكو دایکیشم کە دییان بووم بە قوتابی یەکی
هەوڵدەر زۆر دڵخۆش بوون پێم . لە تیپی باسکت بۆڵیشدا
وەرگیرام . هەر دوو رۆژ جارێ دوو سەعات لەگەڵ برادەرەکان
مەشقی باسکت بۆڵم ئەکرد . لەو رۆژانەشا کە مەشق نەئەکرا
بەسەر بەفرو سەهۆڵدا خۆم هەڵئەخلیسکاند یان یاری ی هۆکیم
ئەکرد . بێ تاقەتی بە هیچ جۆرێ رووی تێ نەئەکردم .

بەڵام ( کوردە ) لەجیاتی ی ئەوەی وەك پێویستە ئیش بکا چووبوو
هەندێ بەرازی هیندیو مشکی سپیو کیسەڵو سێ ژیژکی
کڕیبوو . رۆژی تا ئیوارە بە سەرپەرشتی کردنی ئەو جانەوەرانەوە
ئەبردەسەر ، خۆراکی ئەدانێو بەخێوی ئەکردن . لەگەڵ ئەوەشا
جاروبار یەکێك لەو دەعبایانەی نەخۆش ئەکەوتو وایش ئەبوو
ئەتۆپی . سەگێکی بوو ناوی ( لۆپزیك ) بوو ، نازانم لەکوێ ی
هێنابوو ، تووتکەیەکی خوێری ی بێ بنەچەو رەگەز بوو ، بچکۆلەیەك
بوو ، بەڵام ئەیزانی تازە هەڵئەداو لەمەوپاش گەورە ئەبێ . تووکێکی

ڕەشی درێژو جووتێ گوێچکەی شۆڕی پێوەبوو . ( کوردە ) لە سەر جادە دیبووی و هێنابوویەوە بۆماڵەوە و ئەم ناوەی لێنابوو ، هەرچەند ناوی سەگیش نییە ، چونکە (لۆپزیك) بەو مشارە بچووکانە ئەڵێن کە نەخش و نیگاریان پێ هەڵ ئەکەنرێ لەسەر تەختە . ( کوردە ) نەی ئەزانی مەعنای لۆپزیك ئەمەتە . وا تێگەیشتبوو ناوی سەگە .

دیارە ( کوردە ) بەم هەموو ئیش و کارەیەوە کاتی ئەوەی بۆ نەئەمایەوە خەریکی دەرزەکانی بێ ، ئەبوو دایکی ڕۆژی بیست جار پێی بڵێ ئەوجا بچێ کتێبێك بکاتەوە . هەموو ڕۆژێ کە لەسەر ئیش ئەهاتەوە لێی ئەپرسی :

— ئیشەکانی قوتابخانەت جێبەجێ کردووە ؟

— نەء هێشتا ، هەر ئیستا ئەیانکەم .

— ئیستا نە ، دەس بەجێ !

— باشە دایە گیان ، دەس بەجێ ، بەڵام جارێ با نان بە کیسەڵەکە بدەم .

دایکی سەری قاڵ بوو بە ئیش و کاری خۆیەوەو ئەمیش خواردنی ئەدا بە کیسەڵەکەی . لەپڕ کەوتەوە بیری کە ئەبێ قەفەزێك بۆ بەرازە هیندییەکەی دروست بکاو دەستی پێ کرد . پاش تاوێك دایکی لێی پرسییەوە :

— ئاخر کەی ئیشەکانت جێبەجێ ئەکەی ؟

— هەر ئیستا .

— هەر ئیستا کەی ؟ تۆ هەر ئەڵێی هەر ئیستاو کەچی لەجێی خۆیشت ناجووڵێیت .

— هەر ئیستا دایە گیان . ئەبێ قەفەزەکەم تەواو کەم .

— قەفەزی چی ؟ قەفەز بە سێ ڕۆژ تەواو نابێ . هەڵسە ئیشەکانت بکە .

— باشە ، کەواتە سبەینێ قەفەزەکە تەواو ئەکەم . ئیستا تۆزێ ئاو ئەدەم بە ژیژکەکەو هەڵئەسمە سەر ئیشەکانم !

پاش نیو سەعات دایکی دیسان لێی پرسی‌یەوە کەوا گەیشتە کوێ ، کەچی ئەو وەڵامی دایەوە :

— لێم گەڕێ جارێ با ژیژکەکە بدۆزمەوە ، نازانم لەکوێ خۆی مات داوە .

هەمیشە ئەمە حالی بوو . کە ئیشێکی ئەبوایە ئیشێکی‌تری بۆ خۆی ئەدۆزی‌یەوە . کە دایکی ئەچوو بۆخوێندنگاکەی خۆی ، ئەم هەر بیریشی لە ئیشەکانی قوتابخانەی نەئەکردەوە . ئەبوو تا خەو ئەی‌باتەوە بەلادا هەر بەتەما بێ بی‌یان کات . ڕۆژی هەزار درۆی لەبابەت خوێندنەوە ڕێك ئەخست و هیچی نەئەخوێند . کەچی لە گەڵ ئەوەشا پلەی ( خراپ نی‌یە ) ی هەر دەس‌ئەکەوت‌و جاروباریش پلەی ( چاك ) ی دەسگیر ئەبوو ، بەڵام زۆر بەدەگمەن . لە هەموو شتێ زیاتر لە دەرزی زمانی ڕووسی ئەترسا . کە لە گەرداوی ئەم دەرزەش ڕزگاری ئەبوو ، بە سایەی سەری پێ وتنەوە بوو . بەلام هەموو جارێ پێ‌وتن نەئەگەیشتە فریای . ئەگەر دەرزەکە دانان‌و نووسینی تیا بوایە پێشەکی خۆی ئەیزانی پلەی (خراپ)ی تیا وەرئەگرێ ، لەبەرئەوە نەئەهات بۆ ئەو دەرزە . جارێکیان (ئاواز خان ) پێی‌وتین سبەینێ دەرزی دانان‌و نووسینمان هەیە . بۆسبەینێی ئەوڕۆژە ( کوردە ) خۆی نەخۆش خست‌و بە دایکی وت سەری دێشێ ، دایکیشی هێشتی ئەوڕۆژە لە ماڵ بێ‌و نەچێ بۆ قوتابخانەو پێی‌وت کە لەسەر ئیش هاتمەوە دوکتۆرەکەت دێنمە سەر . کەچی

هەر کە دایکی هاتەوە پێی‌وت سەرم چاك بووەتەوەو پێویست نی‌یە زەحمەت بکێشێ بچێ بەدوای دوکتۆرا . دایکیشی پسوولەیەکی بۆ نووسی بۆ قوتابخانە کەوا ئەورۆژە نەخۆش بووە بۆیە نەچووە بۆ دەرزو مەسەلەکە برایەوە. ڕۆژێکی‌تریش هەر دەرزی دانانو نووسینمان هەبوو ، دیسانەوە ( کوردە ) سەری خۆی هێنایەوە ئێش . ئەمجاریش دایکی هێشتی لە مال دەرنەچێ . بەلام کە لەسەر ئێش گەڕایەوە سەیری کرد وا زوو چاك بووەتەوەو نەخۆشی‌یەکەی نەماوە. نەیزانی مەسەلە چی‌یە ، ئەمجاریش پسوولەیەکی بۆ نووسی بو قوتابخانە . تا جاری سێهەم تێ‌نەگەیشت (کوردە) ئەم چەند جارە درۆی لەگەل کردووە خۆی نەخۆش خستووە. (کوردە) لەپێشا نەیویست پێی‌لێ‌بنێ کە نەخۆش نەبوە، بەلام دایکی ترساندێ کەوا ئەچێ بۆ قوتابخانەو ئەپرسێ تا مەسەلەکەی بۆ ساغ ئەبێتەوە. (کوردە) کە ئەمەی لە دایکی بیست حالی بوو کە پلانەکەی بە هیچ دەرچوو ، هەموو شتێکی بۆ دایکی گێڕایەوە .

دایکی کە زانی ئەم هەموو ساختەچی‌یەتی‌یەی بۆ ئەوە کردووە نەچێ بۆ قوتابخانە، گەلێك تووڕە بوو . ئەمە ئەو ڕۆژە بوو کە (کوردە) لۆپزیەکی هێنابوو بۆ مال . دایکی حەزی نەئەکرد ئەو هەموو دەعباو جانەوەرانە بێنێتە مالەوەو لەبریتی دەرزەکانی ، خۆی بەوانەوە خەریك بکا. ناچار سەگەکەی بردە هەویش‌خانەکەو لەوێ شاردیەوە نەوەك دایکی کوتووپڕ بیبینێ . کەچێ هەر لەوکاتەدا کە دایکی لێی تووڕە بوو سەگەکە خۆی کرد بە ژوورا .

دایکی هاواری کرد :

— ئەی ئەمە چی‌یە ؟

( کوردە ) زمانی لەق بوو :

— هیچ !. لەبەرچاوتایە ، سەگە .

— سەگ ؟ ئەبێ هەر ئیستا دەری کەی . باخچەی جانەوەرانمان دانەناوە . تۆ هەمیشە خۆت کردووە بە هاوڕێی دەعباو جانەوەرو ناتەوێ خەریکی خوێندنەکەت ببی . ئەبێ ئیستا هەموو جانەوەرەکانت دەرکەی : مشك‌و پشیلەو ژیژکەکانت هەموویان ! گوێت لێبوو .. سەگەکەش ئەبێ هەر دەرکەی . ئیتر با بەسی بێ !

(کوردە) هیچی بۆ نەمایەوە ، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە هەڵسا دەسی‌کرد بە دابەش کردنی جانەوەرەکانی بەسەر ئاوەڵەکانیا . ژیژکێکی لا مابووەوە کەس لێی وەرنەئەگرت ، ناچار هێنـای بۆ من‌و باسی خۆی بۆ گێڕامەوە . منیش نەم‌ئەویست ژیژکەکەی لێ وەرگرم چونکە جووتە مشکەکە پێشـان دایبوونێ زاوزێیان کردبوو . ئەوەیەکی زۆریان لێ کەوتبووەوەو ژمارەیەکی زۆریان چووبوونە هەویش خانەکەمان . سەرەڕای ئەوەش ژیژکەکە لەڕو لاواز بوو ، ترسم بوو دەردەدار بێ . بەڵام ( کوردە ) بۆی باس کردم کە دەردەدار نی‌یەو هەر ئەوەندەیە کەمێك نووستووە ، چونکە ژیژك عادەتی وایە بەدرێژایی زستان ئەخەوێ . کە وای‌وت لێم وەرگرت . (کوردە)یش وتی کە بەهـار لە خەو ڕاپەڕی ئەیبەمەوە .

(کوردە) لە لۆپزیك بەولاوە هیچ کامی لە جانەوەرەکان لا نەما ، دڵی نەئەهات لۆپزیك بدۆڕێنێ . لە بەرئەوە بڕیاری دا لـە سەربان بیشارێتەوە . بردی لای لولەی زۆپاکەدا لە سەر پەڕۆ شڕەیەك داینا‌و بە پەتێك بە کۆڵەکەی بانەکەوەی بەستەوە تا ڕانەکا . سـەربانەکە زۆر سارد بوو ، بەڵام لولەکە ئەوەندە گەرم بوو لۆپزیك زۆر سەرمای نەئەبوو هەرچەند جاروبار کەلێك ناڕەحەت ڕای‌ئەبوارد چونکە لە یەك کاتا سـەرمایشی ئەبوو گەرمیشی ئەبووەوە : کە سـەرما زۆر سـەخت بوایە

لووله‌كه زۆر گه‌رم ئه‌بوو ، له‌و كاته‌دا لایه‌كی لۆپزیك له‌گه‌رمانا ئه‌برژاو لاكه‌ی‌تری له‌سه‌رمانا ئه‌ته‌زی ! ( كورده ) ترســی زۆر لـه‌وه هه‌بوو له سه‌رمانا گوێچكه‌كانی ببن به‌ته‌خته ، یا تووشی‌هه‌لاّمه‌ت ببێ ! به‌دزی‌یه‌وه خۆراكی بۆ ئه‌برده سه‌ر بان‌تا بێ‌تاقه‌ت نه‌بێ . كه دایكیشی له‌ ماڵ نه‌بوایه ئه‌یهێنایه خوارو له‌ژووره‌وه یاری‌ی‌له‌گه‌ڵ ئه‌كردو به‌رله‌وه‌كه دایكی‌بێته‌وه ئه‌ی‌برده‌وه سه‌ربان . له‌پێشـا ئیش به‌ رێك و پێكی ڕۆیی تا جارێكیان نازانم له‌ یادی نه‌بوو زوو بیباته‌وه ســه‌ربان ، یان دایكی زوو له‌ ئیش گه‌ڕابووه‌وه ، پێ‌ی زانرا . دایكی ـ وه‌ك ئه‌ڵێن ـ بـــه‌ ته‌اوانی دیاری‌یه‌وه ئه‌یكرت . چاوی به‌ لۆپزیك كه‌وت و هاواری كرد :

— ئه‌وه هێشتا سه‌گه‌كه لێره‌یه ؟ وا تێ‌گه‌یشتم بۆچی ده‌ســـت ناكا ئیشـــه‌كانی‌قوتابخانه‌ت جێ‌به‌جێ بكه‌ی ! من پێم‌نه‌وتی‌ده‌ری‌كه ؟ بۆچی هێناته‌وه ؟

( كورده ) پێ‌ی لێ‌نا بۆ دایـكی كـه‌وا به‌كوێ‌ی نه‌كردوه و لۆپزیكی له‌ سه‌ربان‌حه‌شار داوه‌و به‌درێژایی وه‌خت پێ‌یه‌وه‌خه‌ریك بووه‌و خۆراكی بۆ بردووه . وتیشی زۆری خۆش ئه‌وێ‌و ناتوانێ به‌م ســـه‌رما ســـه‌خته ده‌ری‌كا چونكه ته‌نها خۆیه‌تی و جێ‌یه‌ك شك نابا بۆی بچێ !...

— ئه‌گه‌ر ئیشه‌كانی قوتابخانه‌ت به‌ باشی جێ‌به‌جێ بكردایه رێگـام ئه‌دای ڕای‌گری ، به‌لاّم تۆ هه‌ركیز ناته‌وێ قسه بچێ به‌ گوێتا .

— ناتوانم ! كه ده‌س ئه‌ده‌مـه ئیش‌وكاره‌كانی قوتابخانه‌م هه‌ر بیر له لۆپزیك ئه‌كه‌مه‌وه . له‌ دڵی خۆمدا لێكی‌ئه‌ده‌مه‌وه ئاخۆ لۆپزیك چی‌بـكا لـه‌ـه‌ربان . ڕه‌نگ‌بێ له‌به‌ر تـه‌نهایی زویر بێ . كه‌ئه‌م خه‌یالاّنه ئه‌كه‌مه‌وه ناتوانم خه‌ریكی ئیشه‌كانم ببم .

دایكی به‌زه‌یی پیا هاته‌وه‌و وتی :

— گفتم بده‌یتێ هه‌موو ڕۆژێ هه‌ر كه له‌ قوتابخانه گه‌ڕایته‌وه ،

ئیشەکانت بە ڕێكوپێکی بکەی ، ڕێگات ئەدەم ڕای گری .

(کوردە) ئەم گفتەی دایە . دایکیشی پێی وت :

— ئەبینین ، بزانین چۆن ئەم گفتەت ئەبەیتە سەر . لەمڕۆ بەدواوە هەموو ڕۆژێ خۆم سەرپەرشتی ئیشەکانت ئەکەم .

ئەم قسەو باسە ، ڕۆژی دوایی (کوردە) خۆی ، کە لە قوتابخانە هاتینەوە ، بۆی گێڕامەوە . هەروەها وتی :

— وەرە بۆ ماڵی خۆمان پیشانت دەم لۆپزیك چۆن پەروەردە ئەکەم . سەگێکی زۆر زیرەکە . ئەتوانێ عاسایەك بە کەڵبە بگرێ .

پێم وت :

— عاسا بە کەڵبەگرتن زیرەکی یەکی زۆری پێ ناوێ .

— وانی یە . نیشانەی زیرەکی یە . دیارە تۆ پێویستت بە زیرەکی نی یە تا بتوانی عاسا بە دان بگری ، بەڵام لۆپزیك وەك تۆ نی یە .

چووم بۆ ماڵیان . قاپێك شەکری لە دۆڵابی خواردەمەنی یەکەیان دەرهێناو بانگی کردە سەگەکە . لۆپزیك کە چاوی بە قاپەکە کەوت ، لە خۆشی یانا کەوتە قونەقونو کلکە لەقە . زۆر باش ئەیفامی (کوردە) مەبەستی چی یە . (کوردە) عاساکەی لەژێر لووتیا ڕاگرت و وتی :

بیگرە ، کولۆیەك شەکرت ئەدەمێ .

بەڵام لۆپزیك ، لووتی لەسەر عاساکە لاداو بە قنگی چاو سەیرێکی قاپەکەی دەسی ( کوردە )ی کرد .

( کوردە ) نەڕاندی بەسەریا :

— مەڕوانە بۆ قاپەکە , عاساکە بگرە !

دیاربوو لۆپزیك لە سەر ئەوە سووربوو کە عاساکە نەگرێ . ناچار ( کوردە ) دەمی داپچڕیو عاساکەی خستە نێوان هەردوو ڕیزی کەلبەکانی . بەلاّم هەر کە دەســـتی لێ بەردا لۆپزیك دەمی کردەوەو عاساکەی کەوتە خوار . ( کوردە ) بۆلاّندیو وتی :

— ئەوەی دوێنێ فێرم کرد لەبیری چووەتەوە . ئەبێ دیسانەوە فێری کەمەوە .

جارێکیتریش عاساکەی نایە ناو دەمیو بە منی وت کـــە پۆزی توند بگرم تا نەتوانێ دەم بکاتەوە . بەمچەشنە لۆپزیك تا ماوەیەك عاساکەی بە دەمەوە گرت . ( کوردە ) لە پاداشـــی ئەوەدا کولۆیەك شەکری خەلاّت کردو ، چەند جاریتریش مەشقی پێ کرد . لۆپزیك وردە وردە تێگەیشت هەر جارێ عاساکە بگری بە دەمیەوە کولۆیەك شەکری ئەدرێتێ . وای لێ هات بەتەنها خۆی ئەیگرت ، بەلاّم بەریشی ئەدا بۆئەوەی شەکرەکە وەرگرێ . ( کوردە ) دەسی نەکێشایەوەو شەکرەکەی نەئەدایە تا ناچاری بکا عاساکە بەدەمیەوە بگرێ .

ئەوڕۆژە درەنگ گەڕامەوە بۆ ماڵ ، ڕوانیم تێکرای پرۆگرامی ڕۆژم تێکداوە . بڕیارمدا لە پشووی هاویندا منیش سەگێك ڕاگرمو پەروەردەی کەم . ئێستا جارێ پێویست نییە چونکە پەروەردەکردنی وەختێکی زۆری پێ ئەوێ . دەســم دایە فێربوونی دەرزی ژمارەکەم بە باشی ، چونکە نابێ دیسانەوە پلەی ( خراپ ) ی تیا وەرگرم . ئەبێ پێشان بخوێنم . پاشان ئەتوانم سەگ ڕاگرمو خۆمی پێوە خەریك کەم .

بەلاّم ( کوردە ) کە هەمیشە وەختی خۆی لەگەل سـەگەکـەی ئەبردە سەر ، وەنەبێ هەر ئەوەی فێر کردبێ عاساکە بە کەلبە بگرێ ، ئەوەشـــی فێر کردبوو هەلّی بگرێو بەدوایا بیبا . ڕاسـتە

لۆپزیك ئەمەی بەخۆڕایی بۆ نەئەکرد ، بەرامبەر بەوە شـــەکری وەرئەگرت ، بەڵام هەوڵێکی زۆری ئەدا . بەرامبەر بەکۆڵۆیەك شەکر عاسایەك ، بەڵکو تێلایەکی لێرەوە تا شەقامی ئێسکە ئەبرد .

( کوردە ) پێی‌وتم لەمەوپاشیش گەلێ شتی‌تری فێر ئەکات . بەڵام جارێ ئێستا هیچی‌تری پیشان نادا ، هەر ئەوەی بەسە .

( کوردە ) حەز ناکا زۆر خۆی بە یەك شتەوە خەریك بکا . هەر تاوێ لەسەر بەزمێکەو تا سەر خەریکی شتێ نابێ .

# بەشی یانزەهەم



پۆلەکەمان دەمێك بوو ئارەزووی بوو جارێك بڕۆین بۆ سەیری سێرك . ( کامەران ) گفتی دابوو تکت بۆ هەموو قوتابییەکان بڕێ . ئێمەش هەموومان بەدڵ و دایەن چاوەڕانی ئەو ڕۆژە بووین کە ئەڕۆین . پێشان چەند جار چووبووین بۆ سینەما ، بەڵام هەرگیز نەچووبووین بۆ سێرك . من زوو سێرکم دیبوو ، ( کوردە ) یش زووتر دیبووی ، بەڵام شتێکی وای لێ لە یاد نەمابوو . زۆر منداڵ بوو کە چووبوو بۆ سێرك . تەنها ئەوەندەی لێ ئەهاتەوە یاد کۆمەڵێك دڕندەری دیوە ، شێرو پڵنگ و ڕەنگبێ ئەسپیشی تیا دیبێ . لەوە بەولاوە هەمووی لەبیر چووبووەوە . ئێمە بەشێوەیەکی تایبەتی ئەمانویست ئەو ماتۆڕ سایکل سوارە ببینین کە لەناو تۆپێکی قەبەی

شیشە ئاسنا ئەخولێتەوە . پێشان هەندێ ( بۆزانین )مان لەم بابەتەوە دیبوو کوترابوون بە دیوارەکانی ناو شـــاراو ، کەلێك قسەو باسی سەیرمان سەبارەت بەو کابرا بیستبوو کە بە سواریی ماتۆرەکەیەوە ئەچێتە ناو تۆپێکی گەورەی شیشە ئاسن‌و تیا ئەسووڕێتەوەو کە دەس ئەکا بە خولانەوە بێ تۆپەکە لائەبەن‌و ئەو بە لای سەریەوە ئەمێنێتەوەو خەریکی خولاندنەوەی خۆی ئەبێ‌و ، لە هەموویش سەیرتر ئەوەیە تۆپەکەی بێ نەماوە ، کەچی نایشکەوێتە خوارەوە . بۆیان باس کردبووم کە ئەو لە خولانەوەدا ئەکەوێتە پەلە ، شـــتێك هەیە پێی ئەڵێن هێزی فڕێدەر ئەینووسێنێ بە تۆپەکەوەو نایەڵێ بکەوێتە خوار ، بەڵام کە خولانەوەکەی خاو کردەوە هێزە فڕێدەرەکە هیچ کەڵکی نامێنێ‌و دائەکەوێ .

هەندێ لە قوتابی‌یەکان ئەڵێن هەموومان نابەن بۆ سەیری سێرك چونکە ( کامەران ) تکتی بۆ کشتمان دەس‌ناکەوێ . لەبەرئەوە تـەنها قوتابی‌یە هەرە باشەکان ئەبەن کە ئەوانەن هەر پلەی (زۆر چاك)یان وەرگرتووە . هەندێکی تریشیان ئەڵێن هەموو قوتابی‌یەکان ئەبەن (کوردە) نەبێ . تاقمێکی‌تریش ئەڵێن کەس نـاڕوا چونکە تکت هەمووی فرۆشراوە .

ئاخری تکت کڕراو هەموومان تەنانەت (کوردە)یش چووین بۆ سێرك . بەرلەوەی دەس‌بکرێ بە پیشان‌دان ئێمە گەیشتینەجێ . باشتر ئەوەیە پیاو زوو بگاتە جێ ، چونکە پاشان ڕێگای نابێ دانیشێ . لەجێی خۆمانا دانیشتین‌و سەیرێکی مەیدانی پیشاندانەکەمان کرد کە فەرشێکی گەورەی تیا ڕاخرابوو . بەسەر سەریشمانەوە گوریس توند کرابوو ، لە لای سەریشەوە کە پێی ئەڵێن گومەزی جۆلانـە ، ئەڵقەو پەیژەی گوریس‌و شتی‌تر شۆڕ بووبوەوە . هۆڵە گەورەکە وردە

وردە پڕ بوو تا لە ئەنجاما وای لێ‌هات وەك بڵێی خەڵکی شارەکە هەموو هاتبن بۆ ئەوێ . ویستم دانیشتووەکان بژمێرم ، تا ٢٣٠م ژمارد . پاشان لێم تێکچوو . دیسانەوە تێ‌هەڵچوومەوە ، بەڵام ئەمجار لەپڕ دەیان گڵۆپی گەورەیان داگیرساندو هۆڵەکە وەك ڕۆژی نیوەڕۆی لێ‌هات . هەموو خەڵکەکە خۆیان کورج کردەوە . دیمەنەکە لەوە ئەچوو وەك بڵێی ڕۆژی جەژنە : خەڵکەکە هەمە ڕەنگە بوون . لە دڵی خۆما ئەموت هێشتا زۆری ماوە بۆ دەس‌پێ‌کردن . دەسم کرد بە تەماشاکردنی دانیشتووەکان . ئەوەندی پێ نەچوو ئاوازەی مۆسیقا بەرز بووەوە ، پاش ئەوە دەس‌کرا بە تەپڵ لێدانێکی بەسامو کەمانچە ژەندن‌و فوو کرا بە کەڕەنادا . تیپێك لە یاری‌کەرەکان بە پەلە چوونە ناو مەیدانەکە بازیان ئەداو سەرمەقولاتیان ئەبردو خۆیان بەحەواوە هەڵئەواسی‌و بە قاچ خۆیان دائەهێلاو وەك چەرخ ئەخولانەوە . ئێمەش حەزمان ئەکرد بچینە ناو مەیدانەکەو وەك ئەوان بکەین . هەڵسامە سەرپێ ، بەڵام (ئاواز خان) دای‌نیشاندمەوە تا بەرچاوی خەڵکەکەی تر نەگرم . کەسی تر لەجێی خۆی نەجوولا ، منیش ناچار دانیشتمەوە ، بەڵام من لە بەردەمی ئەو یاری‌کەرانەدا کە هەڵیان ئەخستەوە خۆم بە هێمنی پێ ڕاگیر نەئەکرا . حەزم ئەکرد بەدرێژایی شەو بمێنمەوە تەماشایان بکەم ، کەچی زۆری پێ‌نەچوو بە ڕاکردن مەیدانەکەیان بەجێ‌هێشت . ڕام کەرێك بەخۆی‌و کۆمەڵێك ورچەوە هاتە شوێنەکەیان . ئای لە ورچ چەند زیرەکە ! بەسەر پەتا ئەڕواو لە جۆلانەدا خۆی بەم‌دیوو ئەو دیوا ئەخاو ئەچێتە سەر بەرمیل و بە پێ خلی ئەکاتەوە و خۆیشی بەسەریەوە ئەڕوا . دوانیشیان سواری ماتۆڕسایکلێك بوون .

پاش ورچەکان سەرە هاتە سەرهاوسەنگی‌کەرەکان : بە پەتا ئەکەوتن ولاقیان ئەکردە حەواو جار لەدوای جار بە پێ پارچە تەختەیان

هەڵ ئەداو ئەیان گرتەوە و هەڵیان ئەدایەوە .. من لە دڵی خۆما ئەموت خەڵکی تر ناتوانن بە دەس ئەمە بکەن کە ئەمان بەقاچ ئەیکەن ...

ئەنجا نۆبە هاتە سەر سەگەل : هەڵ ئەبەزینەوەو سەرمەقولاتیان ئەبردو پاڵیان بە سەگی ترەوە ئەنا بۆ ناو عەرەبانە و فتبۆڵێنیان ئەکرد .. سەگێکیان زۆر بە زات بوو سەرکەوتە سەرەوە بۆ ژێر کومەزی‌یەکەو بە پەرەشۆت هاتە خوارەوە .. ژنەکە ، کە ئەم یاری‌یانەی بە سەگەکان ئەکرد وتی ئیستا سەگێکتان پیشان ئەدەم ژمارە بزانێ . کورسی‌یەکی هێناو سەگێکی رەشی بچکۆلەی لە سەر دانیشاندو سێ بەردی لە بەردەمیا داناو داوای لێ کرد بۆیان ژمێرێ . لە دڵی خۆما لێکم دایەوە سەگ بێ و زمان نەزانێ ئەی چۆن ئەی ژمێرێ ! سەیرم کرد سەگەکە سێ جار وەڕی . خەڵکەکە دەسیان کرد بە پێکەنین و بۆیان دا لە چەپڵە ، ژنەکەش پارچەیەك شەکری دایە ، ئەمجار پێنج بەردی خستە بەردەمی‌و پێی وت :

— بژمێرە !

سەگەکە پێنج جار وەڕی .

ئەمجار ژنە چەند ژمارەیەکی لە سەر مقەبایەك نووسی‌و پیشانی‌دا ، سەگەکەش بێ هەڵە وەڵامی دایەوە .

پاشان ژنەکە لێی پرسی :

— ئەی ( ٢ ) کەڕەت ( ٢ ) ئەکاتە چەند ؟

سەگەکە چوار جار وەڕی .

— ئەی ( ٣ ) و ( ٤ ) ئەکاتە چەند ؟

سەگەکە حەوت جار وەڕی .

— ئەی (٤) لە (١٠) دەرکەی چەندی ئەمێنێتەوە ؟

— سەگەکە شەش جار وەڕی .

سەرسامی کردین . ئەمە چۆن سەگێکە هەم کۆکردنەوەو هەم دەرکردنیش ئەزانێ !

دوای ئەوەش دوو کابرای تەڵەکەباز هاتنە مەیدان . قاپو قاچاخو شتیوایان هەڵئەدا بە ئاسماناو بە دەس ئەیان گرتنەوە . هەرکامیان یەك لەدوای یەك چواری هەڵئەداو ئەی گرتنەوە . ئەنجا هەردوکیان قاپەکانیان هەڵئەدا بۆ یەکتر . وەی چەند وریا بوون ! کاتێك کە ئەمیان قاپی بۆ ئەویان هەڵئەدا ، ئەویش هەڵی ئەدا بۆ ئەمو یەك لە یەکیان ئەگرتەوە . بەدرێژایی وەخت قاپ لەوەوە ئەهات بۆ ئەمو لەمەوە ئەچوو بۆ ئەو . هی کەسیشیان نەی ئەدا لە هی ئەویانو هیچیان نەئەشکان .

لۆتی یەکیش لەو ناوەدا بوو ، پانتۆڵێکی شینی کاڵو چاکەتێکی شلی لەبەرا بوو . شەپقەیەکی سەوزی کردبوە سەریو لووتێکی سور ، بەڵێ سوور ، ی پێوەبوو . خۆی لەڕاستیدا هونەرمەند نەبوو ، بەڵام ئەیویست لاسایی هونەرمەندەکان بکاتەوە . ئەوان چی ئەکەن ئەویش بیکات ، هەرچەند بەشێوەیەکی زۆر قەڵبیش لاسایی ئەکردنەوە . لە گەڵ تەڵەکەبازەکان هاتبوو . پاشان ڕۆیشت سێ داری هێناو هاتەوە ، ئەیویست یاریان پێ بکا ، بەڵام قوڕ کرا بەسەریا : یەکێك لە دارەکان بەسەر سەریەوە کەوتە خوار ، هیچی لێ نەهات . خۆی دەرباز کردو هەڵات . پاش لێ بوونەوەی ورچەکانیش کە سواری ماتۆڕ سایکلەکە بوون ئەویش ویستی وا بکات ، بەڵام خۆی دا بە دیوارەکەداو ماتۆڕەکەی بوو بە هەزار پارچەوە . تاقمێك سوار هاتنە مەیدان ، ئەویش داوای کرد ئەسپێکی بدەنێ سواری بێ ، بەڵام ئەترسا بکەوێتە خوار ، ویستی بیبەستنەوە بە پەتێکەوە . کوریستێکیان لەسەرەوە بۆداهێڵا خوارەوەو لە

پشتەوە بەستیان بە پشتێنەکەیەوە . ویستی لە دواوە سواری ئەسپەکە ببێ ، ئەسپەکە لەقەیەکی لێدا . ئەمجار ویستی پەیژەیەك بێنێ داینێ پیا سەرکەوێ سواری ئەسپەکە ببێ ، بەڵام چونکە بەسرابوەوە بە کوریسەکەوە نەیتوانی بڕوا . داوای لە یەکێك لە سوارەکان کرد سواری ئەسپەکەی بکا ، سوارەکەش ویستی سواری کا ، بەڵام کابرای لۆتی قاچی نەئەکەیشتەوە .

کابرای سوار خۆی بۆ دانەواند بچێتە سەر پشتی ، لەژێریەوە هەر خۆی هەڵئەبڕی‌و تێی‌ئەخوڕی :

— دە سوار بە !

بەڵام کابرای لۆتی لەجیاتی‌ی ئەوەی سواری ئەسپەکە ببێ ، چووە کۆڵی سوارەکە ! سوارەیش دەستی کرد بە غارکردن بەناو مەیدانی سێرکەکەدا بەجۆرێك سەربەقوڕی پێ ئەهاتە پێکەنین . کابرای لۆتی‌یش بە خۆی‌و چاکەتە شلیەوە بەکۆڵیەوە بوو . کابرای سوار لەژێرەوە ئەی‌شیراند :

— من وتم « سواری ئەسپەکە ببە » تۆ بۆ سواری خۆم بووی ؟ ئاخری لە کۆڵی سوارەکەیان داگرت‌و خستیانە سەر پشتی ئەسپەکە. ئەسپە بۆر کەوتە غار . زۆری پێ‌نەچوو کابرای لۆتی‌ی خستە خوار ، بەڵام نەکەوتە زەوی چونکە کوریسەکە بەسرابوو بە پشتێنەکەیەوە . بۆخۆی بە حەواوە شۆڕ بووەوە ، بە ڕاست‌و چەپا تەکە تەکی ئەهات ، چوار پەلی بڵاو کردبوەوە . یەکێك بوو لەوانەی ئەیانەوێ هەموو شتێ تاقی بکەنەوە ، کەچی لەوە زیاتر کە خەڵك پێیان پێ‌ئەکەنێ هیچیان دەسگیر نابێ .



دوا یاری ، یاریی ( تۆپی ئازایی ) بوو . ئێمە لە ماوەی پشوودانا نەچووینە دەرەوە ، هەموو ئیشە سەرەتاییەکانی خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو یارییەمان دی . پێشان بەشەکانی نیوەی سەرووی تۆپەکەیان نا بە یەکەوە . ئەوەندە گەورە بوو جێگای بیست کەسی تیا ئەبووەوە بێ ئەوەی جێگایان تەسك بێ . پاشان ئەو نیوەیە بەرز کرایەوە بۆلای گومەزییەکەو دەس کرا بە پێکەوەنانی ئەو نیوەکەیتریش کە ئەوەندەی نیوەی سەروو گەورە بوو . ئەنجا دوو

ماتۆرسایکلو دوو پایسکلیان تێخست و ئەمیشیان بەرز کردەوەو لەگەڵ نیوەی سەرەوە نانیان بەیەکەوە . بێ تۆپەکە دەلاقەیەکی تیابوو پەیژەیەکی گوریسی لێوە شۆڕ کرابوە خوارەوە بۆ زەوی .

پشووی حەسانەوە دوایی هاتو خەڵکەکە هاتنەوە جێی خۆیان دانیشتن ، گوڵۆپی گەورە داگیرسێنرا ، ماتۆڕ لێخورەکان هاتنە مەیدان ، کراسی شینی کاڵیان لەبەر کردبوو شەپقەی خڕی وەك هی فڕۆکەوانیان لەسەر نابوو . سێ کەس بوون : دوو پیاوو ئافرەتێك . لە لێواری مەیدانەکەدا وەستان . خەڵکەکە چەپڵەیەکی گەرمی سڵاو لێ کردنیان بۆ لێدان . دەس کرا بە مۆسیقا ژەندن ، سێ کەسەکە بێ ترس و لەرز بە سەری بەرزەوە بەسەر پەیژە گوریسەکەدا سەرکەوتن . یەك لەپاش یەك لە دەلاقەکەوە چوونە ژوورەوە بۆ ناو تۆپەکە . ئەنجا دەلاقەکەیان گرتو لەناوەوە دەسیان کرد بە سوورانەوە بە پایسکل. پێشان لەبەر ئەوە کە توند لە پایسکلەکەیان نەئەخوڕی ، هەر لە قاتی بنەوەدا ئەسووڕانەوە . بەڵام کە کەوتنە پەلە ، سەرکەوتنە سەریشەوە تا ئاخری وایان لێهات ڕاکشان ، بەجورێك بنیادەم نەی‌ئەزانی چۆن ئەکەن وا ناکەون . یەك یەکو دوو دوو ئەخولانەوە . لێهاتوویی ژنەکەیش لەم مەیانەدا لە هی پیاوەکان کەمتر نەبوو .

ئەنجا لێخوڕی ماتۆڕ سایکلەکە سواری ماتۆڕەکەی بوو ، گرەگری بەرز بووەوە وەك شەستیر بتەقێ . بەوپەڕی گورجی‌یەوە بەناو تۆپەکەدا کەوتە گەڕ ، دەنگێکی وەك دەنگی گرمەی هەور هات ! ماتۆڕ سواری دووهەم دابەڕی‌یە قاتی بنەوە ، کەچی ماتۆڕ سواری یەکەم هێشتا بەسەرەوە ئەخولایەوە !

لەوکاتەدا دیم بێ تۆپەکە وردە وردە ئەهاتە خـوار ، کەچی

لێخوڕی ماتۆڕەکە هێشتا بەسەرەوە ئەخولایەوە . کە بنی تۆپەکە گەیشتە زەوی ، ژنەکەو پیاوێکی لێ هاتنەدەر ، بەڵام پیاوەکەی تریان هێشتا لەسەرەوە هەر خەریکی سووڕانەوە بوو . ئەو ئەگەر بوەستایە ، هێزە فڕێدەرەکە نەئەمـاو ئەکـەوتە زەوی ، بۆیە ئەبوو هەمیشـە زۆر بەگورجی بسووڕێتەوە . سەیرمان ئەکردو هەناسەمان لێ بڕابوو . لە دڵی خۆما لێکم ئەدایەوە : « چۆن ئەبێ ئەگەر ماتۆڕەکە هەناسەیەك پەکی بکەوێ ؟ دیارە زۆر بەتوندی لە تۆپەکە دەرئەپەڕێ و ئـەدا بە زەویداو پارچە پارچە ئەبێ ! » .

تاو تاو وام ئەزانی دینەمۆی ماتۆڕەکـە پەکی ئەکەوێ ، بەڵام هەموو شتێ بە باشی ئەڕۆیی ، تا جارێکیتریش بنی تۆپەکـە بەرز کرایەوەو نرایەوە بە سـەرەکەیەوە . ئەمجار کابرای ماتۆڕ لێخوڕ وردە وردە دەستی شل کردو کەم کەم هێڵی سووڕانەوەکەی خـۆی تەسك کردەوە . هات بۆ بنی تۆپەکە ، جا وەستاو دەلاقەی تۆپەکە کرایەوەو کابرا داپەڕییە خوار . نالەی چەپڵە ڕێزانێکی توند بەرز بووەوە .

کە پیشاندانەکە دوایی هات زۆرم پێ ناخۆش بوو ئەگەڕێمەوە . ناتوانم باسی ئەندازەی ئەو خەفەتە بکەم کە بەهۆی ئەوەوە دایگرتم . لە دڵی خۆما وتم کە گەورە بووم هـەموو ڕۆژێ ، یا هیـچ نەبێ هەفتەی جارێ ، ئەچم بۆ سێرك و هـەرگیز لە تەماشاکردنی سێرك بێزار نابم .

# بەشی دوانزەهەم



سبەینێ چووم بۆلای (کوردە) بزانم ئەبێ چی بدەم بە ژیژکەکە بیخوا ، چونکە بیری خۆی گۆڕیبوو ، نیازی خەوتنی نەمابوو . شەو لە خەو هەستاو دەستی کرد بە گەڕان بە ناو ژوورەکەداو دەنگە دەنگێکی نایەوە هەموو دانیشتووانی ماڵەکەی لە خەو ڕاپەڕاند . کە چوومە لای ( کوردە ) ئەبینم لەسەر پشت ڕاکشاوە لاقی کردووەتە ئاسمانو جانتاکەی وا بەدەسیەوە . لێم پرسی:

— بۆ ڕاکشاوی ؟

— ئەمەوێ ببم بە یاریکەری جومباز . ئەم جانتا بەسەر پێمەوە ئەخولێنمەوە .

— بە دەس جانتاکەی بەرز ئەکردەوەو ئەیویست بە پێ هەڵی سووڕێنێ ، بەڵام نەی ئەتوانی . پێی وتم :

— هەر ئەوەندەی زەحمەتە بتوانم بە پێ بیگرم . یارمەتیم بدە ، جانتاکە بگرە بیخەرە سەر پێم .

وامکرد . تاوێك ڕاوەستاو ئەنجا بە ئاستەم دەستی بە سووڕاندنەوەی جانتاکە کرد . ئەوەندەی پێ نەچوو جانتا هەڵخلیسکاو کەوتە زەوی . (کوردە) کە ئەمەی دی وتی :

— کار بەمجۆرە ناچێتەسەر . ئەبێ قۆندەرەکانم داکەنم لە

پێم ، جانتاكە بەسەر تۆندەرەكەمەوە ناوەستێ .

قۆنـدەرەكەی داكەندو لەسەرپشت كەوتەوەو لاقی كردەوە ئاسمان . منیش جانتاكەم بۆ نایە سەر پێی . وتی :

— خۆیەتی . ئەمە لە هەمووی چاترە !

دەسی كردەوە بە سووڕاندنەوەی جـانتاكە . جـانتا بەسـەر قاچیەوە هەر لەقە لەقی بوو . لەپڕ كەوت بەسەر سكیا . زۆری ئازار پێ گەیاند . هاواری لێ بەرز بووەوە .

— ئای ! وەخت بوو بمكوژێ . جـانتاكە زۆر قورسە . ئەبێ شتێكی سووكتر بێنم !

كونو قوژبن ئەما نەكەڕێین بەدوای شتی سـووكا ، هیچمان دەس نەكەوت . ناچار پشتی یەكی هێناو پێچایەوەو بە پەتێك بەستی . وەك باسترمەی لێ هات . پێی وتم :

— ئەزانی پشتی یەكە نەرمە ، بیشكەوێ بەسەرما ئازارم نادا .

دیسان لەسەر پشت كەوتەوەو پشتی یەكەی نایە سەر پێی و ویستی بیسووڕێنێتەوە . بەڵام ئەمجاریش بۆی نەچوە سەر . ناچار بوو وتی :

— نەء ! بۆئەوەی دەس پێ بكەم ، ئەبێ پێشـان فێر ببم بە پێ هەڵی سووڕێنم وەك جومبازكەرەكان كە لە سێركەكە دیمانن . ئادەی تۆزێ لە دوورەوە بۆم فڕێدە ، منیش هـەوڵ ئـەدەم بیگرمـەوە .

پشـتی یەكەم هەڵـگرتو چوومە دواوە . بە هەموو هێزی خۆم بۆم فڕێدا ، نەكەوتە سەر پێی ، كەوت بەسەر سەریا ، هاواری كرد :

— هەی كەر ! چاوت نی یە ؟ ئەبێ بۆ قاچمی فڕێ دەی .

پشتی یەكەم هێنایەوەو فڕێم دا بۆ قاچی . ( كوردە ) قاچی خۆی جووڵاند ، بەڵام نەیتوانی ڕای گرێ . چەند جاری تریش بۆم فڕێدا تا جارێكیان توانی بیگرێتەوەو نەیەڵێ لەسـەر قاچی بكەوێتە

خوار . هاواری کرد :

— ئەبێی یاری‌کەرێکی ڕاستەقینەی جومبازم !

منیش ویستم خۆم تاقی کەمەوە ، لەسەر پشت کەوتم ، ویستم بە پێ پشتی‌یەکە بگرمەوە ، بەڵام تاقەجارێك پێم نەگیرایەوە . ماندوو بووم ، پشتم هاتە ژان ، وەك بڵێی کۆلێکی قورسم بەکۆڵەوە بێ . (کوردە) وتی :

— ئەمڕۆ با بەسی بێ بە پشتی . ئێستا کورسی تاقی ئەکەمەوە . ئەڵێی چی ؟



کورسی‌یەکی هێناو لەسەری دانیشتو دەسی کرد بەم دیوو ئەودیو کردنی تا لەسەر پێچکەکانی دواوەی بوەستێ . ئاخری توانی کەمێك بیوەستێنێ ، بەڵام گورج کەوتو خۆیشی کەوت بە قنگا ، ئازارێکی زۆری پێ‌گەیی . منیش ویستم خۆم تاقی کەمەوە ، بەڵام منیش بە کورسی‌یەکەوە کەوتم ، پشتی سەرم بریندار بوو .

( کوردە ) پێی‌وتم :

— ئەبێی ؟ ! ئەبوو دەسمان بە مەشقی گران نەکردایە . با خۆمان فێری تەلەکەبازی بکەین .

— بە چی ؟

— بە قاپو قاچاخ ، وەك لە سێرکا ئەیکەن .

- دەی . من یەکێکیان هەڵئەدەم بۆ تۆو تۆیش ئەویان هەڵدە بۆ من . کە من هێنەکەی خۆم هەڵدا بۆ تۆ ، تۆیش کورج هێنەکەی خۆت هەڵدە بۆ منو هێنەکەی من بگرەوەو منیش هێنەکەی تۆ کورج ئەگرمەوە .

— جارێ بوەستە .. هەردوکیان ئەشکێنین .

— وایە . بڕوانە : پێشان بە یەك قاپ دەس پێئەکەین . کە بە قاپێك فێر بووین ئەوجا دوان ئەگرین بەدەستەوە . پاشان سیانو پاشتریش چوار .. تا وەك تەڵەکەبازە ڕاستەقینەکانمان لێ دەرئەچێ .

لە فڕێ دانی یەکەما قاپی یەکەم شکا . لە فڕێدانی دووهەمیشا قاپی دووهەم شکا . ( کوردە ) وتی :

بەم جۆرە بێ هەموو قاپەکان ئەشکێنین . ئەبێ پارچە فافۆنێك بگرین بەدەستەوە .

چوە چێشت خانەکە تەشتێکی بچووکی هێنا . دەسمانکرد بە مەشق کردن پێی . هەر کە هەڵیدا بۆم دای بە پەنجەرەکەدا ، بەڵام باش بوو شووشەکەی نەشکاند ، درزێکی تێکرد .

( کوردە ) وتی :

— شتێکی ناخۆش بوو ، چۆنی چاك کەینەوە ؟

— ڕەنگ بێ بتوانین قاقەزی پیا بلکێنین !

— نابێ .. ناشیرینتر ئەبێ ! ئەزانی چی ئەکەم ؟ شووشەیەك لە پەنجەرەی دالانەکە دەرئەهێنم ئەیخەمە جێگەکەی ، کەس پێی نازانێ .

هێلمەکەیمان هەڵکەند . ویستمان شووشەکە دەرکەین ، بەڵام

درزەکەی گەورەتر بوو ، شووشەکە شکا ، بوو بە دوو پارچەوە ،
( کوردە ) وتی :
— ئەمە بایەخی نی‌یە ، ئەتوانین شـــووشەی شکاو بخەینە پەنجەرەی دالآنەکە .
ئەوجا چووین شووشەیەکمان لە پەنجەرەی دالآنەکە دەرهێنا . بەلآم تۆزێ گەورە بوو ، لە چوار چێوەی پەنجەرە شکاوەکەی چێشت‌خانەکەدا جێی نەئەبووەوە . ( کوردە ) وتی :
— ئەبێ ببڕین . کەس ناناسی ئەلماسی بێ ؟
— وابزانم ( جوامێر ) هەیەتی .
چووین بۆلای ( جوامێر ) ، پارچە ئەلماسەکەیمان هێناو هاتینەوە . گەڕاین بۆ شووشەکە نەمان‌دۆزی‌یەوە . ( کوردە ) دەسی‌کرد بە بۆڵە بۆڵ :
— هیچ نەماوە ئەمە نەبێ ! تەبەقە شووشەکە چی لێ‌هات ؟
هەر لەم‌کاتەدا پێ‌ی‌نا بە تەبەقە شووشەکەدا کە لەســەر زەوی دانرابوو . شووشەکە لەژێر پێ‌یدا هاڕەی هات . ( کوردە) هاواری کرد :
— چ کەرێك شووشەکەی لەسەر زەوی داناوە ؟
— خۆت !
— دلنیای تۆ دات‌نەناوە ؟
— هەرگیز . من هەر دەسیشم لێ نەداوە . نەئەبوو لەســەر زەوی داینێی . شـــووشە لەسەر زەوی بێ کەس نایبینێ‌و لەوانەیە بکەوێتە ژێر پێ .
— باشە ، بۆ وەختی خۆی نەت‌وت ؟
— هەر بە خەیالیشما نەهات .

— بەڵێ ! تۆ ناتوانی بیر بکەیتەوە ، ئێستا بەچاوی خۆت ئەیبینی دایکم چیم پێ ئەکا . چی بکەین ؟ شووشەکە بووە بە پێنج پارچەوە . چارمان نی یە ئەوە نەبێ بیخەینەوە پەنجەرەی دالآنەکەو ئەمی تریشیان بخەینەوە پەنجەرەکەی ئێرە . هەرچۆن بێ ئەم لەو باشترە .

ویستمان شووشە شکاوەکە بخەینەوە پەنجەرەی دالآنەکە ، بەلآم پارچەکانی نەئەوەستان . هەوڵماندا پینەی کەین ، بەلآم دنیا سارد بوو ، قاقەزی کەتیرەکە نەئەنووسا بە شووشەکەدا . وازمان لێ هێناو چووین شووشەکەی تر دامەزرێنین لەژوورەکەدا کە ئەوەبوو بووبوو بە دووپارچەوە ، بەلآم پارچەیەکیان لە دەستی ( کوردە ) کەوتە خوارو بوو بە چەند پارچەوە . لەم کاتەدا دایکی ( کوردە ) لە ئیش گەڕایەوە. (کوردە) ناچار هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە . دایکی پێی وت : ئای ڕۆڵە ! لە منالێکی بچووك بەدتری ! وام لێ هاتووە ناوێرم بە تەنها لەماڵدا بەجێت بێڵم . ئەترسم شتێکت لە دەس بقەومێ .



( کوردە ) وتی :

— دایە ، سەیرکە ! وا پارچەکان ئەخەمەوە سەر یەك . ئەیانلکێنمەوە بە یەکەوە .

— جــوانە ! پارچەکان ! ئەبێ بڕۆی بەدوای شووشەگەرەکەدا ، بانگی کەی بێت شووشەی تازەیان تێ خا . ئەی ئەمە چی یە ؟

— قاپێکم شکاند .

دایکی تەنها ئاخێکی هەڵکێشاو ئیتر چاوی نا بەیەکاو سەری خۆی خستە نێوان هەردوو لەپی وەك بڵێی سەری هاتبێتە ژان . پاشان هەروەکێ دەسی لە هەموو شتێ داشتبێ دەسەکانی لابردو ، وتی :
— ئەو کوتە شووشانە کۆکەرەوەو دەس کە بە ئیشەکانت . دیارە هێشتا سەیری دەرسەکانت نەکردووە ؟! پارچە شووشەکانم لەگەڵ ( کوردە ) کۆکردەوەو بردمان کردمانە تەنەکەی خۆڵەکە . بە ( کوردە ) م وت :
— دایکێکی چەند چاکت هەیە ! ئەگەر من لە ماڵا وام بکردایە تا ئێوارە نەئەبڕایەوە .
— چاوت نەفڕێ . منیش قسەیەکی دوورو درێژم هەر لەگەڵ ئەکرێ .. کەمێك چاوەڕوانی بکە تا پوورە ( زارا )م دێتەوە بزانە چیم پێ ئەکاو چی بە تۆیش ئەکا !.
بەڵام من چاوەڕوانیم نەکرد تا پوورە ( زارا )ی دێتەوە ، ڕام کردەوە بۆ ماڵی خۆمان .
سبەینێ بەیانی لە سەرجادە تووشی ( کوردە ) بووم . پێی وتم لەجیاتی ی ئەوەی بچێ بۆ قوتابخانە ئەچێ بۆ دەرمانخانە چونکە خۆی بە نەخۆش ئەزانێ لە قوتابخانە کە ( ئاواز خان ) پرسی ( کوردە ) بۆچی دیار نی یە ، پێم وت ئەمڕۆ نایەت ، لە سەرجادە تووشی بووم وتی نەخۆشم ئەچم بۆ نەخۆشخانە .
( ئاواز خان ) پێی وتم :
— پاش دەرز بڕۆ بۆ لای هەواڵی بپرسە .
ئەو ڕۆژە دەرزی نووسینمان هەبوو . کە گەڕامەوە بۆ ماڵ ئیشەکانی قوتابخانەم کردو پاشان چووم بۆ لای ( کوردە ) . دایکی لە ئیش هاتبووەوە . ( کوردە ) هەر کە دیمی پەنجەیەکی نایە سەر

دەمی و سەرێکی لەقاند ، واتە : هیچ نەڵێی . حاڵی بووم کە شتێکی پێیە ئەیەوێ پێم بڵێ ، لەگەڵیا چوومە دالانەکە . پێی وتم :

— بە دایکم نەڵێی نەهاتبووم بۆ قوتابخانە !

— باشە ، ئەی بۆ نەهاتی بۆ قوتابخانە ، ئەی لە نەخۆشخانە چی یان پێ وتی ؟

— هیچ !

— چۆن هیچ ؟

— دوکتۆرەکە کابرایەکی دڵ ڕەق بوو . تێم گەیاند کە نەخۆشم ، بەلام ئەو وتی « نەء » . وتم « ئەمڕۆ ئەوەندە پژمیوم وەخت بوو تەپڵی سەرم داکەوێ » . وتی « هیچ نی یە ، خۆی چاك ئەبێ » !

— جا ڕاست نەخۆش نیت ؟

— نەوەڵڵا نەخۆش نیم !

— باشە ، ئەی بۆ چوویت بۆ نەخوشخانە ؟

— بەیانی بە دایکمم وت نەخۆشم . وتی « بەسە بەس ، ئیتر پسوولەت بۆ نانووسم . ئەگەر نەخۆشی بڕۆ بۆ نەخۆشخانە » .

— باشە ، ئەی کە نەخۆش نیت بۆ بە دایکت وت نەخۆشم ؟

— تێ ناگەی ؟ ( ئاواز خان ) وتی ئەمڕۆ دەرزی نووسینمان هەیە ، لەبەرئەوە نەم ئەتوانی بێم . لات وایە زۆرم پێ خۆشە پلەی ( خراپ ) وەربگرم ؟

— ئەی ئێستا چی ئەکەی ؟ ( ئاواز خان ) سبەینێ لێت ئەپرسێ بۆچی دوێنێ دیار نەبووی ؟

— چی ئەکەم ؟ چوزانم .. ڕەنگ بێ سبەینێش نەیەم . ئەگەر ( ئاواز خان ) لێی پرسیت بڵێ نەخۆشە .

— بەلام ، برام ، ئەمەی تۆ ئەیکەی کەریەتی یە . ڕاستی یەکەی

بگێڕەوە بۆ دایکت و داوای لێ بکە پسوولەیەکت بۆ بنووسێ .

— نازانم ... وتی ئیتر پسوولەت بۆ نانووسم، با فێری خۆ لە قوتابخانە ونکردن نەبی .

— باشە ... سبەی نایەیت و دوو سبەیش نایەیت .. ئەی ئاخری چۆن ئەبێ ؟ دایکت حالی بکە ، ئەو لێت تێ ئەگا ..

— باشە .. ئەگەر نەترسم پێی ئەلێم .

( کوردە ) سبەینێیش نەهات بۆ قوتابخانە . بە عەقلی خـۆم وتم دیارە نەیوێراوە قسە بۆ دایکی بکا .

( ئاواز خان ) دەنگ و باسی ( کوردە )ی لێ پرسیم . قسەم بۆ کرد کەوا نەخۆشە . ( ئاواز خان ) ویستی بزانێ چی یەتی ، وتم هەلامەتیەتی .

بەم جۆرە بە تاوانی ئەم کەرە بە درۆزن دەرچووم ! بەلام لەگـەل ئەوەشا مادەم داوای لی کردووم هیچ نالێم ، ناتوانم درۆکەی دەرخەم !

# بەشی سیانزەهەم



کە لە قوتابخانە هاتمەوە چووم بۆ لای ( کوردە ) و بۆم گێڕایەوە کە بەهۆی ئەوەوە درۆیەکم لەگەڵ ( ئاواز خان) کرد .(کوردە) وتی هەر لە بەیانی یەوە تا نیوەڕۆ بە ناو بازاڕا سووڕاوەتەوە ، چونکە نەیوێراوە قسەی ڕاست بۆ دایکی بکاو نەشیویستوە بە بێ ئەوەی پسووڵەی نەخۆشی لە دایکیەوە پێ بێ ، بێ بۆ قوتابخانە . لێم پرسی :

— ئەی نیازت وایە چی بکەی ؟ هیچ بە دایکت نالێی ؟

— نازانم . خولیایەك کەوتووەتە سەرم ، ئەڵێی چ-ی بچمە سێرك ؟

— سێرك ؟

— ئا . ببم بە هونەرمەند .

— بەڵام لە سێرکا چی ئەکەی ؟

— زۆر باشە . ئەوان چی ئەکەن منیش ئەوە ئەکەم . اۆپێزیك

فێری ژمارە ئەکەمو دیمەنێکی پێ پیشـــان ئەدەم وەك ئەوەی
لە سێرکەکەدا دیمان ژنەکە لەگەڵ سەگەکەیی کرد .

— ئەی ئەگەر وەریان نەگرتی ؟

— وەرم ئەگرن !

— ئەی قوتابخانەکەت ؟

— قوتابخانە ؟ ناچمەوە بۆ قوتابخانە . بەڵام هـا ئەکەی بە
( ئاواز خان ) بڵێی . هاوڕێیەکی بەوەفا بە !

— دایکت لەئەنجاما هەر پێت ئەزانێ کەوا ناچی بۆ قوتابخانە .

— لەپێشا نازانێ ، پاشانیش هەموو شتێك چار ئەکرێ . کە
دەسم کرد بە دیمەن پیشاندان ، ئەوسا هەموو شتێکی بۆ ئەگێڕمەوە .

— بەڵام ڕەنگبێ نەتوانی لۆپزیك فێر کەی ؟

— بۆ ناتوانم ؟ هەر ئیستا دەس پێ ئەکەم . لۆپزیك !

لۆپزیك بە ڕاکردن هاتو بە دەوری (کوردە )دا دەسی کرد بە
کلکە سووتە . (کوردە)ش قوتووی شەکرەکەی لە دۆڵابەکە دەرهێناو وتی:

— لۆپزیك وا فێری ژمارەت ئەکەم . ئەگەر فێر ببی باش
ژمارە بکەی ، کوڵۆیەك شەکرت ئەدەمێ ، ئەگینا هیچت نادەمێ .

لۆپزیك سەیرێکی کوڵۆ شـەکرەکەی کردو زمانێکی دەرکێشاو
ئەملاو لای دەمی لستەوە . ( کوردە ) پێی وت :

— ئیستا نە ، پاشان زمانت دەرکێشەو دەمت بلێسەرەوە !

دە کوڵۆ شەکری بەدەستەوە گرت و وتی :

— ئـەمڕۆ فێرت ئەکەم لە (١) ەوە بژمێری تا (١٠) .
سبەینێیش بەرەو ژوور ئەبینەوە . بڕوانە (١٠) کـوڵۆ شـەکرم

پێیە ، دەس ئەکەم بە ژماردنیان . ئاگات لێ بێ لەبیرت نەچێ .
کوڵۆ شەکرەکانی لە بەردەمی سەگەکەدا لەسەر کورسی یەکە ریز کردو بە دەنگێکی بەرز دەسی کرد بە ژماردنیان (یەك ... دوو ... سێ ... ) هەر بەمجۆرە تا دە .
— دیت ؟ دە کوڵۆیە .. حاڵی بووی ؟
لۆپزیك کلکێکی لەقاندو ملی بۆ لای شەکرەکە درێژ کرد. بەڵام ( کوردە ) پلتۆکێکی لە سەری اووتی داو پێ ی وت :
— پێشان فێری ژمارە ببە !
پێم وت :
— چۆن ئەتەوێ بە یەكجار فێر ببێ تا دە بژمێرێ ، وا لەوێ ئێمە خۆمان بە یەك جار فێر نابین .
— کەواتە وا باشترە پێشان تا پێنج یا تا سێ ی فێر بکەین .
— وایە ، تا سێ ئاسانترە .
هەشت کوڵۆی لە شەکرەکە هەڵگرت . تەنها دوو کوڵۆ لەسەر کورسی یەکە مایەوە .
— سەیرکە لۆپزیك ، تەنها دوو کوڵۆ ماوە : یەك . . دوو . . ئەگەر یەکێکیان هەڵگری تەنها یەکێکیان ئەمێنێتەوە ، ئەگەر دایئەنێیتەوە ئەبنەوە بە دوو . وەڵامم بدەرەوە چەند کوڵۆ شەکر لێرەدایە ؟
لۆپزیك راست بووەوەو دەسی کردەوە بە کلکە لەقێ . پاشان چیچکەی کردەوەو دەسی کردەوە بە زمان لستنەوە . .
بە ( کوردە ) م وت :
— هێشتا فێری قسەت نەکردووە ، چۆن بە تەمای وەڵامت بداتەوە ؟

— پێویست ناکا ، با وەك سەگی سێرکەکە قسە بکا : وەو ! وەو ! حالی بووی ، لۆپزیك : « وەو ! وەو ! » واتە دوو جار . دە بیلێرەوە : « وەو ! وەو ! » .

لۆپزیك سەیرێکی منو (کوردە)ی کرد . بەڵام هیچی نەوت . (کوردە) لێی پرسی :

— بۆ قسە ناکەی ؟ شەکرت ناوێ ؟

بەڵام لۆپزیك لەجیاتیی ئەوەی قسە بکا ملی بۆ شەکرەکە درێژ کردەوە . (کوردە) توند نەڕاندی بەسەریا :

— نەء !

لۆپزیك لەترسانا کشایەوە دواوەو بێدەنگ دەسی کردەوە بە زمان لستنەوە .

— دە وەرە دەی ! بڵێ « وەو ! وەو ! » .

منیش دوابەدوای ئەو وتم :

— بڵێ : « وەو ! وەو ! » .

( کوردە ) بە سەرسامیەکەوە وتی :

— تێناگا ! ئەبێ فێڵێك بدۆزینەوە بۆ هاندانی . سەیر کە من ئیستا مەشق بە تۆ ئەکەم ، جا ئەویش تەماشای تۆ ئەکا چی ئەکەیو لە تۆوە فێر ئەبێ .

— ئەتەوێ چۆن مەشق بە من بکەی ؟

— زەحمەت نییە . دەسو قاچت ئەنێیتە زەویو دەس ئەکەی بە وەڕین . سەگەکەیش تەماشات ئەکاو سەیر ئەکا تۆ چی ئەکەی ، ئەویش لە تۆوە فێر ئەبێ .

دەسرو قاچم لای سەگەکەدا
نایە زەوی . ( کوردە )
لێی پرسیم :
— وەڵام بدەرەوە : ئەم
کوڵۆ شەکرانە چەندن ؟
بە دەنگێکی بەرز وەڕیم :
— وەو ! وەو !



ئافەرینێکی کردمو کوڵۆ شەکرێکی نایە دەمم . منیش بە دەنگێکی بەرز دەسم کرد بە کرماندنی شەکرەکە تا تامە تامەی لۆپزیکی پێ بدەم . لۆپزیك سەیرێکی کردم . ئارەزووی شاکر خواردنی هەڵسابوو . لیك بە لالەغاوەیا ئەهاتە خوار . ( کوردە ) ئەنجا وتی :

— لۆپزیك ، باش سەرنج بدە ، یەك کوڵۆ شەکرم بە دەستەوە ماوە . بڵێ : وەو ! هەر یەکجار بڵێ . تێ‌گەیشتی ؟ دەی چەند کوڵۆ شەکرم لە دەستایە ؟

لۆپزیك مرقەیەکی کردو چاوێکی گێڕاو کلکی دا بە زەویدا .
( کوردە ) پێی‌وتەوە :

— دەی ، وەڵام بدەرەوە !

بەڵام لۆپزیك هیچ حاڵی نەبوو کە ئەبێ بوەڕێ . ( کوردە ) وتی :

— دیارە کەرێکی تەواوی !

ئەنجا ڕووی کردە من و وتی :

— تۆ وەڵام بدەرەوە .

هاوارم کرد :

— وەو !

شەکرەکەی تریشی نایە دەمم . لۆپزیك دەسی کردەوە بە مرقە مرقو زمان لستنەوە . ( کوردە ) وتی :

— تامە تامەی ئەدەم !

شەکرێکی تری لەسەر کورسی یەکە داناو ، وتی :

— هەرکەس پێشان وەلاّم بداتەوە شەکرەکە بۆ ئەو ئەبێ . دەی بژمێرە دەی !

کورج من هاوارم کرد :

— وەو !

(کوردە) ئافەرینێکی کردمو لایەکی بەلای لۆپزیکا کردەوەو وتی :

— تۆ ! تۆ کەرێکی بە چوار پێ ئەڕۆی !

دەسی برد کولۆیەك شەکری هەلگرتو بەئاسپەم بە ژێر لووتی لۆپزیکا هێنای و خستیە ناودەمی من . منیش دەسم کرد بە کرماندنی بە دەنگێکی بەرز . لۆپزیك کەوتەوە زمان لستنەوەو پژمەیەکی کردو لە خەفەتدا سەرێکی لەقاند . ( کوردە ) ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو ، وتی :

— ئەوەی بوەڕێ کولۆیەك شەکر وەرئەگرێ . ئەوەش نەوەڕێ هیچی نادرێتێ .

شەکرێکی لە بەردەمی لۆپزیکا دانایەوەو وتی :

— سەرەتە ، بژمێرە !

لۆپزیك زمانێکی لستەوەو سەرێکی لەقاندو ڕاست بووەوە . دیسانەوە دانیشتەوەو دەسی کردەوە بە مرقە مرق . ( کوردە ) پێی وتەوە :

— بژمێرە ، دەی ، ئەگینا شەکرت نادرێتێ !

لۆپزیك تاوێك بیری کردەوە . ئەنجا کشایە دواوەو لوورەیەکی بە سامی کرد . ( کوردە ) هاواری لێ هەڵسا :

— فێر بوو !

کوڵۆیەك شــەکری بۆ فڕێدا . لۆپزیك دەس بەجێ قۆستیەوەو قووتی دا . ( کوردە ) بانگی لێ کردەوە :

— ئەمجاریش بژمێرە :

لۆپزیك ئەمجاریش وەڕی :

— وەو !

( کوردە ) شەکرێکی تریشی بۆ هەڵداو پێی‌وت :

— ئەمجاریش !

— وەو !

( کوردە ) بەمە زۆر دڵشاد بوو ، وتی :

— فێر بووە ! سەگێکی زۆرزانی لێ دەرئەچێ !

تا لەم‌کاتەدا دایکی ( کوردە ) خـۆی کرد بە ماڵا ، لە ( کوردە )ی پرسی :

— ئەو قوتووی شەکرە چی‌ئەکا لەسەر ئەو مێزە ؟

— کەمێك شەکرم لێ دەرهێنا ، سەگەکە فێری ژمارە ئەکەم .

— ئەم بەزمە چی‌یە ؟!

— چاوت پێ ئەکەوێ چۆن فێری ژمارە ئەبێ .

شەکرێکیشی لە بەردەمی لۆپزیکا داناو پێی‌وت :

— ئادەی لۆپزیك پیشانی دایکمی بدە چـۆن ژمارە ئەزانی .

لۆپزیك وەڵامی دایەوە :

— وەو !

دایکی پرسی :

— هەمووی هەر ئەمە بوو ؟!
— هەر ئەمە بوو !
— شتێکی گرنگت فێر نەکردووە .
— دایە ، ئەبێ بزانین لۆپزیك بنیادەم نی یە . ئیستا تا یەك ئەزانێ بژمێرێ ، بەلاّم لەمـــەوپاش دوو سێ یشی فێر ئەکەم . بۆ ئاخری فێری هەموو ژمارە یەك ئەبێ‌و چاویشت پێ ئەکەوێ .
— تۆیش بە چاوی خۆت ئەیبینی من چۆن قوتووی شەکردکەت لێ ئەشارمەوە .
( کوردە ) ڕووی خۆی گرژ کردو وتی :
— شەکر بۆ من نی یە ، بۆ زانستە !
— زانست ! ئەی ئیشەکانی قوتابخانەت ؟ کردووتن ؟
— هێشتا نەم کردوون . تاوێکی تر ئەیانکەم .
— تۆ گفتت دامێ هەمیشە بەرلەوەی من بگەڕێمەوە بی یان کەی .
— ئەیانکەم . دایە گیان ئەمڕۆ بەهۆی لۆپزیکەوە لەبیرم چوو .
— زۆر باش بزانە ئەگەر لەکاتی خۆیا ئیشەکانت نەکەی نایەڵم شەکر بەری‌و لێت ئەشارمەوە .
لەگەل ( کوردە ) دانیشتم دەسمان کرد بـە جێ‌بەجێ کردنی ئیشەکانی قوتابخانەی ، چونکە ئەو نەی‌ئەزانی چیمان خوێنـدووە . سبەینێیش دەسمان کردەوە بە مەشق کردن بە لۆپزیك .
( کوردە ) شتێکی بە خەیالاّ هات :
— ئەنها ئەوە بەس نی یە فێری ژمارەی بکەین ، ئەبێ فێری ژمارە خوێندنەوەیش بێ .
پارچـــە مەقەبایەکمان هێنـــاو لێمان نووسـی (۱)و پیشـانی مەگەکەمان دا . ( کوردە ) پێی‌وت :

— لۆپزیك سەیرکە ، ئەمە ( یەك )ە ، وەك کولۆ شەکرەکە .
وەلامم بدەرەوە : ئەمە چەندە ؟
سەگەکە وەلامی دایەوە :
— وەو !
— ئافەرم ، زوو حالی بوو . ئەنجا دێینە سەر ( دوو ) .
دوو کولۆ شەکری لەپێشی لۆپزیکا داناو پێی‌وت :
— بیژمێرە !
لۆپزیك وەلامی دایەوە :
— وەو !
— وا نییە ! تۆ ( یەك ) جار وەڕیت ، کـــەچی شەکرەکان
( دوان )ن . ئەبێ چۆن وەلام بدەیتەوە ؟
لۆپزیك دیسانەوە وەلامی‌دایەوە :
— وەو !
— وەو ! بۆ « وەو ! » ؟ ئەبێ بڵێی : « وەو ! وەو ! » . ئەمە
کەللەیە پێتەوە ، یا « ســـندووقی بۆیاخ » ە ؟
بەلام لۆپزیك هەر وەلامی ئەدایەوە : « وەو ! » .
— ناتوانی ئەم ئاوازەت بگۆڕی ؟ « یەك » کوا ؟
( کوردە ) ئەوەندە توند نەڕاندی بەســـەریا لۆپزیك ترساو
کشایە دواوە . بە ( کوردە )م وت :
— مەشیڕێنە بەسەر سەگەکەدا . ئەبێ بە ئەدەب قسەی لەگەڵ
بکەی ، ئەگینا ئەترسێو فێری هیچ نابێ .
( کوردە ) دەستی کردەوە بە لێکدانەوە بۆ لۆپزیك کەوا
« یەك » واتە « یەك »و « دوو » واتە « دوو » . ئەنجا لێی‌پرسی :
— دە ئیستا بژمێرە !

— وەو !

ویستم تێی بگەیەنم :

— جارێکی تریش .

بە قنگی چاو سەیرێکی کردم ، منیش سەرێکم بۆ لەقاند واتە « ئا »و بە چاویش ئیشارەتم بـــۆ ئەکرد ، لەوکاتەدا بە دوو دڵی یەکەوە « وەو ! »ێکی تری کرد ( کوردە ) نەشـەی سەرکەوتن گرتی و وتی :

— خۆیەتی ، وا وتی « دوو » .

شەکرێکی تری بۆ فڕێ‌داو پێی وت :

— بیڵێرەوە !

لۆپزیك تەنها جارێك وەڕی . پێم‌وت :

— جارێکی تریش !

( کوردە ) وتی :

— فێری مەکە . ئەبێ خۆی فێر ببێ . دەی زووکە ، لۆپزیك وەڵامبدەرەوە !

لۆپزیك تاقە جارێك وەڕی .

— تەواوە ، بەڵام ئەبێ دوو جاریتریش بوەڕی .

دەستی کردەوە بە ژمارە فێر کردنی . لۆپزیك هەر کەڕەتی یەك‌جار ئەوەڕی ، بەڵام کە بیـدی‌یایە بە تەمای شتێکی تریشێ لێ‌ی ، جارێکی تریش ئەوەڕی . کـە گەیشتینە ئەوە یـەك لەدوای یەك دوو جار بیهێنینە وەڕین ، دەسمان کرد بە فێرکردنی کە سێ جار بوەڕێ . ئیشەکە بە ئارەزووی خۆمان ئەڕۆیشت ، بەجۆرێك هەر ئەو شەوە تا (١٠) ژمارەمان فێر کرد . بەڵام بۆ سبەینێ کە (کوردە) ویستی پێی‌بلێتەوە دیتی سەری لێ تێك‌چووە . کە (٣)ی

پیشان ئەدا ئەو (٤) جار یا (٥) جار یا (١٠) جار ئەوەڕیو ، کە (١٠)ی پیشان ئەدا ئەو(٢) جار ئەوەڕی • بەکورتی وەڵامەکانی ئەوەندە بێمەعنا بوون ( کوردە ) ی تووڕە کرد • وایئەزانی لۆپزیك بە دەسەنقەست وائەکا• لەبەرئەوە لەداخا ئەی نەڕاند بەسەریا • جاریوایش ئەبوو لۆپزیك وەڵامی ڕاستی ئەدایەوە • ڕەنگێ ئەو جارانە بە ڕێکەوت بووبێ ، بەڵام ( کوردە ) ئەیوت :

— ئەبینی ! باشی وەڵام دایەوە • ئەمە نیشانەی ئەوەتە ئەزانی • کەچی ئەگەر جارێکیتر لێیبپرسم نازانێ وەڵام بداتەوە •

( کوردە ) وایئەزانی لۆپزیك تاقەتی خوێندنی نەماوەو بە دەسەنقەست بە هەڵە وەڵام ئەداتەوە تا لێیگەڕێین بۆ خۆی بحەسێتەوە • بۆیە کە ژمارە (٥)مان پیشان ئەدا ئەو (٤) جار ئەوەڕی •

— باش تەماشای کە ، لۆپزیك ، (٤) نییە •

( کوردە ) بە خۆشی لەگەڵی ئەدوا ، بەڵام لۆپزیك هەر (٤) جار ئەوەڕی • ( کوردە ) ئەیویست قەناعەتی پێ بکا :

— کەللە ڕەق • زۆر باش ئەبینی (٤) نییە •

بەڵام لۆپزیك هەر کەللەڕەقیی ئەکردو لەسەر ئارەزووی خۆی سوور بوو (٤) جار ئەوەڕی • ئەمجارە بەڕاستی ( کوردە ) ی تووڕە کرد :

— هەی کەر ! ڕاستی بژمێرە ، دەسم بە دامێنت !

کەچی لۆپزیك هەر (٤) جار ئەوەڕی •

— چوار شەقازلە ئەگرم بە بنا گوێتا با تێبگەی چۆن سەرم دێشێنی • دەی ئەمجاریش بیژمێرە ، جا چاوت پێئەکەوێ !

دیسانەوە لۆپزیك هەر چوار جار وەڕی •

( کوردە ) ئیتر خۆی پێڕانەگیرا ۰ وتی :

ـــ سەیری کە چۆن گاڵتەم پێ ئەکا !

ئەمجار ژمارە (٤)ەکەی هەڵگرت و پیشانیدا :

ـــ ئەی لاتوایە ئەمە چەندە ؟

لۆپزیك لە وەڵاما (٥) جار وەڕی ۰

ـــ سەیر ئەکەی کە (٥)ی پیشان ئەدەم (٤) جار ئەوەڕێ و کە (٤)ی پیشان ئەدەم (٥)جار ئەوەڕێ ، کەچی تۆیش ئەڵێی بە دەسەنقەست واناکا بۆ ئەزیەت دانم ۰ من خۆم ئەزانم بۆچی وا ترۆیەیە لێم ۰ ئەم بەیانی‌یە پێم نا بە پێیا ، بۆیە ۰ بە دەسەنقەتیش وام‌نەکرد ، بەڵام ئەو لە یادی نەچووەتەوەو وا ئیستا تۆڵەم لێ ئەسێنێ ۰

من نەم‌ئەزانی لۆپزیک بە دەسەنقەست وائەکا یا نە؟ بەڵام دڵنیا بووم ئەم مەشق پێ‌کردنەیمان هیچی لێ پەیدا نابێ ۰ ڕەنگە بێ من و ( کوردە ) مامۆستای چاك نەبووبین ، ڕەنگیش بێ لۆپزیك تەمەڵ بووبێ و لە حیساب نەگەیشتبێ ۰

بە ( کوردە )م وت :

— باشتر ئەوەیە هەموو شتێ بۆ دایکت بگێڕیتەوە و بیبێتەوە بۆ قوتابخانە ۰

— نەء ، تازە پێم ناکرێ ! دەمێکە قوتابخانەم بەجێ هێشتووە ۰ ئەگەر دایکم پێم بزانێ نازانم چیم پێ ئەکا ۰ خۆیشت ئەزانی هیچ پێویست بە پێکەنین نی‌یە ۰ خۆزگە لە یەك ڕۆژ زیاتر خۆم ون نەکردایە ۰

پێشنیارم بۆ کرد :

— لات چۆنە ئەگەر بڕۆیتە لای ( ئاواز خان ) پرسی

پێ بکەی ؟
— ناکرێ . ڕووم‌نایەت !
— ئەگەر تۆ شەرم ئەکەی ، ئەتوانم من پێی‌بڵێم .
— ئەتەوێ بڕۆیتە لای بەدرۆم بخەیتەوە . بڕۆی ئیتر هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم .
— من نامەوێ بەدرۆت بخەمەوە . تۆ خـــۆت ئەڵێی ڕووم نایەت . کەواتە من پێی‌ئەڵێم با شەرم نەتکرێ .
بە گاڵتە پێ‌کردنێکەوە دەسی کرد بە لاسایی کردنەوەم :
— « با شەرم نەمکرێ » ! ئەگەر پێی‌بڵێی زۆرتر شـــەرم ئەمکرێ . تۆ مادەم هیچت پێ ناکرێ هـەر ئەوەندەت لەســـەرە ورتەت لە دەم دەرنەیەت .
— باشە ، ئەی چـی کردن ؟ تۆ وا هیچت دەسـگیر نەبوو لە لۆپزیك ، کەوابوو نایشتوانی بچیتە سێرك ، مەگەر هێشتا هەر بـە تەمای ئەوەی مەشق بە سەگەکە بکەی !
نەء ، تازە هەوڵدان لەگەڵی کـەڵکی نەماوە . لۆپزیك یـا زۆلە یا کەرە . هەرکامیان بێ کـــەڵکی لێ وەرناگیرێ . یا ئەبێ سەگێکی‌تر پەیدا کەم یا ببم بە پاڵەوان .
- چۆن ئەبی بە پاڵەوان ؟
— دەس‌ئەکەم بە سەرمەقولات بردن‌و لەسـەر دەس ئەڕۆم بـە ڕێدا . پێشان شێوام تاقی کردووەتەوەو کەمێك تیا سـەرکەوتووم . بەڵام نەمتوانی ماوەیەکی زۆر قاچم بـە حـەواوە بهێڵمەوە . ئەبێ لەپێشا یەکێك قاچم بگرێ ، پاشان خـــۆم فێر ئەبم . ئادەی تۆ بمگرە با خەریك بم .
لەسەر هـەر چـوار پەلی دانیشت‌و هـــەر دوو قاچی هەڵبڕی‌و

لەسەر دەست کەوتە گەڕ . بەڵام زۆری پێ نەچـــوو دەستەکانی ماندوو بوون و نووشتانەوەو بەسەر سەرا کەوت . هەڵسایەوە دەسی بە سەر خوراندن کرد و وتی :

-- قەیدی نی یە . وردە وردە قۆڵم بەهێز ئەبێ ، ئەوجا ئەتوانم بە بێ یارمەتی ی کەس بڕۆم بە ڕێدا .

-- وەختێکی زۆری ئەوێ تا ئەبی بە پاڵەوان !

-- قیمەتی نی یە . بەم نزیکانە پشووی نیوەی سـال دێت . لە ئێستاوە تا ئەوکاتە چاری کاری خۆم ئەکەم .

-- ئەی لەوەودوا ؟ پشووی نیوەی سال تەنها چـەند ڕۆژێکە !

-- باش ئەوەش تا پشووی هاوین چاری کاری خۆم ئەکەم .

-- ئەبێ زۆر چاوەڕوان بی !

-- قیمەتی نی یە .

( کوردە ) منالێکی سەیر بوو . هەمیشە وەڵامی هەر ئەوەبوو : « قیمەتی نی یە » . لای وابوو هەرچی بە خەیاڵ دایبنێ دێتـەدی . منیش زۆر باش ئەمزانی هیچی بە ڕاست نی یەو هەموو خەیاڵەکانی پاش چەند ڕۆژ ئەبن بە هیـچ .

# بەشی چواردەهەم

دایكو پووری ( كوردە ) بەخەیاڵیشیانا نەئەهات كەوا ( كوردە ) ناڕوا بۆ قوتابخانە . دایكی كە لەسەر ئیش ئەگەڕایەوە یەكەم ئیشی ئەوەبوو ئەچوە سەر ( كوردە ) بزانێ ئیشەكانی قوتابخانەی جێبەجێ كردووە یا نە . تەماشای ئەكرد هەمووی تەواوە ، نەی ئەزانی هەموو ڕۆژێ من دیئم چیمان خوێنـدووە پێی ئەڵێم . ( كوردە ) زۆر ئەترسا لەوە كە دایكی بە فێڵەكەی بزانێ . لەبەرئەوە زیاتر لەوسا كە ئەچوو بۆ قوتابخـانە بایەخی بە ئیشەكانی ئەدا . بەیانیـان جانتاكەی هەڵئەگرتو ئەچوو بە ناوبازاڕا ئەسـووڕایەوە ، نەی ئەتوانی لە ماڵ بمێنێتەوە چونكە پوورە ( زارا ) ی پاش نیوەڕۆ دەرسی هەبوو ، لەبەرئەوە درەنـگ لە ماڵ دەرئەچوو . بەڵام سووڕانەوە بەسەر جـادەدا شـتێكی مەترسیدار بوو . ڕۆژێكیان ئەوەندەی نەمابوو مامۆسـتای ئینـگلیزی تووشی بێ ، ناچـــار بە دزییەوە خۆی كرد بە كۆڵانێكا تا مامۆستا چاوی پێ نەكەوێ . جارێـكیتریش چاوی بە ئافرەتێكی دراوسێیان كەوت ، لەترسـانا لە



قوژبنێكا خۆی پەنا دا تا ئەو تێپەڕی . لەوڕۆژەوە نەی ئەوێرا بە ناو جادەو بازاڕا بسووڕێتەوە . ئەچوو بۆ دەری شار ، نەوەك تووشی یەكێكیوا ببێ بیناسێ . وای ئەزانی هەرچی خەڵكە تەماشـای ئەو

ئەکەنو ئەزانن بە دەسەنقەست نارِوا بو قوتابخـانە . ئەو رِۆژانە
کە ئەو ئاوا ئەسوورِایەوە دنیا ئەوەندە سارد بوو خوێن لە دەماری
بنیـادەما ئەیبەست . جا هەر کە سـەرما لە وزەی ئەخست خۆی
ئەکرد بە کۆکایەکا تۆزێك گەرمی ئەبودوە جا ئەکەوتەوە گەرِان .

من هەستم ئەکرد کە ئەم کردەوە کردەوەیەکی چاك نییە
ئەمەم زۆر پێ ناخوش بوو . بەدرێژایی وەخت بیرم لای ( کوردە )
بوو ، چونکە هەرچەند لام ئەکردەوە بەم‌لاماو شوێنە چۆلەکەیم ئەدی
ئەکەوتەوە یادم . ئەهاتە بەرچـاوم وا بە پەناپـسکێ بەتەنهـا بەناو
شارا ئەسوورِێتەوەو وەك دز خـــۆی ئەکا بەم دەرگاو بەو دەرگادا
گەرمی بێتەوە ، کەچی ئێمەیش لەناو پۆلی گەرما ڕای بالی خۆمان
ئەدەین . ئەم بیرو خـــەیالە نەی‌ئەهێشت هـەتاوەکو باش گوێ بۆ
دەرسەکانیشم شل بکەم . لە مالا هـــەمیشە بیرم لە ( کوردە )
ئەکردەوە . شەو لەتاو ئەو خەو نەئەچوە چاوم ، هـەزار جـــۆرە
خەیال ئەهات بە مێشکما . ئەمویست هۆیەك بدۆزمەوە بۆ یارمەتیدانی
( کوردە ) . ئەگەر بۆ ( ئاواز خان )ی باس ئەکـەم ، دیارە ئەو
هەوڵ ئەدا بۆ گێرِانەوەی ، بەلام ئەترسم بە فیتنـەو دەم نەوەستاو
بدرێمە قەلەم . لەگەل ئەوەشا هـەر حـەزم ئەکرد لەم‌بابەتەوە قسە
لەگەل یەکێك بکەم . بە ( لاولاو )ی خوشکمم وت :

ـــ ( لاولاو ) ، گوێ بگرە . قەت وانەبێ لە پۆلەکەی ئێوەدا
یەکێك خەبەر لە یەکێکی‌ترتان بدا ؟

ـــ مەبەستت چییە ؟

ـــ ئەگەر بێتوو قوتابییەك شـتێك بکا ، هاورێیەکی ئەرِوا بۆ
مامۆستای بگێرِێتەوە ؟ هەرگیز شتێوا رِوویداوە لە پۆلەکەتانا ؟

ـــ ئـا . زۆر دەمێك نییـە شتێکیوا رِوویدا . ( گولزار )

گوڵدانەکەی سەر پەنجەرەکەی شکاند ، ( شنە خان ) یش لای وابوو ئیشی ( سنەوبەر )ە ، ویستی سزای بدا . ناردی بەدوای باوكو دایکیا لەم بابەتەوە قسەیان لەگەڵ بکا ، بەڵام من ئەمزانی (گوڵزار) شکاندوویە ، بە ( شنە خان )م وت .

— بۆ پێت وت ؟ دیارە تۆ فیتنەی !



- نەوەڵڵا فیتنـــە نیــم . ڕاستم وتووە . ئەگـــەر دەنگم نەکردایە (شنە خان) لــەخۆڕایی و بێ تـاوان سزای ( سنەوبەر )ی ئەدا .

- قیمـــەتی چی یە ! تۆ کـــە قسەکەت گێڕایەوە، بووی بە فیتنە ! لای ئێمە کەس قسە لەسەر کەس ناکا .

— کەواتە لای ئێوە لەوانەیە یەکێك بەناهەق تاوانبار بکرێ .

— بۆ ؟

— لە پۆلەکەی ئێوەدا ئەگەر تۆ گوڵدانێك بشکێنی و مامۆستا وابزانێ یەکێکی تر شکاندوویە . .

— جارێ یەکەم ئێمە گوڵدانمان نی یە . ئینجانەمان هەیە .

— فەرقی نی یە ! ئەگەر تۆ ئینجانەیەك بشکێنی و مامۆســـتا وابزانێ ( کوردە ) شکاندوویەو کەس ڕاستی نەڵێ و تۆیش دەنگ نەکەی ، دیارە سزای ( کوردە ) ئەدەن .

— ( کوردە ) خۆی زمانی هەیە ، ئەڵێ من نەمشکاندوە .

— بەڵام ئەمە ڕێ لەوە ناگرێ وابزانن ئەو شکاندوویە .

— ڕێی تێ ئەچێ وابزانن ئیشی ئەوە ، بەڵام مادەم تاوانباری

ڕاستەقینە ئەو نەبێ بەڵگەیەك نابێ بۆ تاوانبار کردنی .

-- قوتابخـانەی ئێمە شێوای تیا نی یە . ناهێڵرێ بێ گوناه لە خۆڕایی تاوانبار بکرێ . تاوانبار ئەبێ پێ لە تاوانی خۆی بنێ . ئەگەر پێی لێ نەنێ هەرکەس ئەتوانێ ڕاستی بڵێ .

-- کەواتە قوتابخانەکەی ئێوە لە فیتنە بەولاوە کەسی تیـا نی یە .

-- نەخێر ! هیچ وانی یە . باشە ، (گوڵزار) باشی کرد ؟ (شنە خان) ئەیویست لەجیاتی ی ئەو سزای یەکێکی تر بدات ، کەچی ئەو ورتەی لە دەم دەرنەئەچوو . زۆری پێ خۆش بوو لەبریتی ی ئەو گومان خراوەتە سەر یەکێکی تر . ئەگەر منیش دەنگم نەکردایە حاڵم لە حاڵی ئەو باشتر نەئەبوو . جا توخوا ئەمە ئیشێکی مەردانەیە ؟

-- باشە ئەمە حاڵەتێکی تایبەتی یە . شتێکی ترت لێ ئەپرسم : هەرگیز ڕووی نەداوە کچێك خۆی ون کا لە قوتابخانەو لە ماڵیشەوە بڵێ بۆ قوتابخانە ئەچم . ؟

-- شێوا هەرگیز ڕووی نەداوە !

-- بێ گومان . کچان شێوایان پێ ناکرێ . ئێوە هەمووتان لە هەوڵ دانا نموونەن .

-- دیارە ئێمە هەموومان هەوڵدەرو خوێندەوارین . بۆچی شێوا لای ئێوە ڕوویداوە ؟

-- نەء . شێوا هەرگیز لای ئێمە ڕوونادا .

-- ئەی بۆ لێم ئەپرسی ؟

-- هەروا . مەبەستم هەبوو .

لەوجارە بەدواوە هیچم نەوت . لەگەڵ ئەوەشا هەمیشە هەر بیرم

له ( کورده ) ئەکردووە . ویستم پرس بە دایکم بکەم ، بەڵام ترسام کورج بڕوا بۆ مامۆستای بگێڕێتەوەو بەڵایەك بقەومێ . لەگەڵ ئەوەشا ئەو هەر هەستی ئەکرد شتێکی ناجۆر لەئارادایە . تاوناتاوێ سەیرێکی ئەکردم وەك بڵێی تێبگا ئەمەوێ قسەیەکی بۆ بکەم . دایکم هەموو جارێ هەست بەوە ئەکا ئەگەر قسەیەکم پێ بێ بمەوێ پێی بڵێم . بەڵام زۆری لێنەئەکردم دەنك بکەم ، چاوەڕوانی ئەوە بوو خۆم قسە بکەم . هەمووجارێ ئەیوت ئەگەر شتێ ڕوویدا وا باشترە بە حەزو ئارەزووی خۆم پێی لێبنێم بۆی . نەمئەزانی چۆنە وا هەست بە شت ئەکا . ئەبێ بزانم هی چییە هەرچی لەدڵما بێ کورج ئەڵێی لە ناوچاوم ئەنووسرێ . هەمیشە ئەمڕوانی بۆ دایکم و لە دڵی خۆما لێکم ئەدایەوە ئاخۆ قسەی بۆ بکەم یا نە ؟ ئەویش هەر تاوناتاوێ سەیرێکی منی ئەکرد وەك بەتەمای ئەوەبێ شتێکی پێ بڵێم . بەمجۆرە وەختێکی زۆرمان بردەسەر . بۆ یەکترمان ئەڕوانی ، بەڵام ، بێئەوەی من هیچم پێوە دیار بێ ، وەك بڵێی خەریکی کتێب خوێندنەوەی خۆمم و ئەویش خەریکی دروومانی خۆیەتی بە هێمنی . ئەگەر دڵم بەهۆی ( کوردە ) وە پڕنەبوایە لە خەیاڵی خەنەتبارکەر ، بۆ ئەوە ئەشیا تێر بەو وەزعە پێبکەنم . ئاخری ئەو خۆی پێڕانەگیرا ، ڕۆژێکیان زەردەخەنەیەکی کردو پرسی :

— وەرە بۆم بگێڕەرەوە بزانم چی قەوماوە ؟

خۆم وا پیشاندا کە حاڵی نەبووم :

- چی ؟

- چییە ئەتەوێ پێم بڵێی ، پێم بڵێ !

- چییە ئەمەوێ پێت بڵێم ؟ ! هیچ شك نابەم بمەوێ پێت بڵێم .

کەچی زۆر باش هەستم ئەکرد ئیستا زوو هەموو شتێکی بۆ ئەگێڕمەوە . زۆر پێخۆشحاڵ بووم بەوە کە ئەو پێشان قسەی کرد ، چونکە قسەکردن ئەوکاتە ئاسانترە بۆ بنیادەم کە داوای لێبکەن نەك کە خۆی لەخۆیەوە بیکا .

ـ ئەمزانی قسەیەکت پێیە ئەتەوێ بۆمی بکەی ! سێ ڕۆژە پێتەوە دیارە لەسەر خۆت نیت . ناشێ وابزانی پێتەوە دیار نییە ؟ کەواتە قسە بکە ! هەرچۆن بێ ئەبڕێتەوەو قسەم بۆ ئەکەی . لە قوتابخانەکەتان هیچ ڕوویداوە ؟

ـ نەء ، هیچ لە قوتابخانە . .

ـ ئەی دیسانەوە پلەی ( خراپ ) ت وەرگرتووە ؟

ـ هیچ پلەیەکم وەرنەگرتووە .

ـ ئەی چیت لێ قەوماوە ؟

ـ هیچ لە من نەقەوماوە .

ـ ئەی لە کێ قەوماوە ؟

ـ لە ( کوردە ) .

ـ چی لێ قەوماوە ؟

ـ نایەوێ بخوێنێ .

ـ چۆن نایەوێ بخوێنێ ؟

ـ نایەوێو ، بڕایەوە !

بیرم کردەوە چون زمانم خەڵەتا باسی ( کوردە )م کرد . لە دڵێ خۆما وتم « خوایە ، چیم کرد ؟! ئەگەر دایکم بڕوا بۆ قوتابخانەو بیگێڕێتەوە بۆ مامۆستا ، من چیبکەم ؟ » .

دایکم لێیپرسیم :

ـ مەسەلە چییە ؟ ( کوردە ) ئیشەکانی قوتابخانەی جێبەجێ

ناکاو پلەی ( خراپ )ی وەرگرتووە ؟

زانیم زمانم زۆر نەخەڵەتاوەو قسەی زۆرم نەکردووە . وەڵامم دایەوە :

ـ ئا ، ئیشەکانی قوتابخانەی جێبەجێ ناکا . پلەی ( خراپ )یشی لە دەرسی ڕووسیدا وەرگرتووە . نایەوێ خەریکی دەرسی ڕووسی بێ • لە پۆلی سێوە وایە .

ـ ئەی چۆن گەیشتە پۆلی چوار ؟

ـ ئاگام لێ نی یە . لە قوتابخانەیەکی ترەوە هاتووە ، لە پۆلی سێدا لەگەڵ ئێمە نەبوە .

ـ ئەی ماموستاکەتان گوێی ناداتێ ؟ ئەبێ ئەم کوڕە بهێنرێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست .

ـ ئەوەندەی ڕێوی یەك فێڵبازە . دەرسەکانی لەبەر کتێبی قوتابی یەکانی تر ئەنووسێتەوەو ڕۆژی دەرسی نووسین نایەت بۆ قوتابخانە .

ـ ئەبێ تۆ هەوڵی لەگەڵ بدەی • چۆن بیری لێ ئەکەیتەوەو خۆتی پێوە خەریك ئەکەیت ، کەچی ناشتەوێ یارمەتی ی بدەی ؟

ـ کە ئەو خۆی نەیەوێ ئیش بکا من چۆن یارمەتی ی بدەم ،

ـ پێی بڵێ ئەبێ ئیش بکەی و هەولیش بدە قسەت کاری تێ بکا . تۆ خۆت فێر بووی بە تەنها ئیش بکەی و ئەویش ئەوەتە کە ئەی بینی • ئەبێ یارمەتی ی بدەی . هاوڕێی باشی دەس کەوێ ڕەوشتی باش ئەبێ و پاشانیش ڕێگای پیاوی ئیشکەرو ڕاست ئەگرێتە بەر .

ـ بۆ من هاوڕێ یەکی خراپم ؟

ـ نەء ، ئەگەر بیر لەو بکەیتەوە هاوڕێی خراپ نیت .

هەستم بە شەرمەزاری ئەکرد کەوا تەواو ڕاستم نەوت بە

دایکم . جـــلەکانم کردەبەرو گورج چـــووم بۆلای ( کوردە ) بۆ ماڵی خۆیان تـا قسەیەکی ڕاستی لەگەڵ بکەم .

بەڕاستی سەیرە ! چییە وا لەم ڕۆژانەدا بەڕاستی بووم بە دۆستی ( کوردە )و شەوو ڕۆژ بیری لێ ئەکـەمەوە ؟ ( کوردە )یش تەواو هۆگری من بووبوو . بێ ئاوەڵەکانی تاقـەتی نەئەگرت . ئەیشیوت لە من بەولاوە دۆستێکیتر شك نابا ,

کە گەیشتمە ئەوێ ئەبینم ( کوردە ) لەگەڵ دایکیو پوورە ( زارا )ی خەریکی چایی خواردنەوەن . کولۆپێك لەسەر مێزەکەی بوو ، تێپڵ لامپێکی گەورەی شیفی کاڵی بەسەرەوە بوو . بەهــۆی ئەو تێپڵ لامپەوە دەورو پشتیان هەموو لە خۆراوای هاوینان ئەچوو . بەڵام هێشتـا تەواو تاریکی نەکردبو . هـــەموویان بە هاتنم پێ خۆشحاڵ بوون . لای خۆیانا دایاننامو چایەكو پارچەیەکێ کێکیان بۆ نامە سەر مێزەکە ، دایکی ( کوردە )و پوورە (زارا)ی هەواڵی باوكو دایکمیان لێپرسیمو پرسییان ئیستا باوکم لەکوێ ئیش ئەکاو خەریکی چییە ؟ ( کوردە ) گوێی شل کردبوو ، بەڵام هیچی نەئەوت ، پارچە کێکەکەی خۆی ئەخستە پەرداخی چایەکەی تا تەواو تەڕ ئەبوو چایەکەی هەڵئەمژیو هەڵئەئاوسا ، وای لێئەهات پەرداخـەکە نەیئەگرت . کەچی وەك بڵێی بیر لە شتێکیتر بکاتەوە کێكو پەرداخو چایەکەی لە بیر نەئەما .

دایکی لێیپرسی :

ـ بیر لە چی ئەکەیتەوە ؟

ـ هەروا ! بیر لە باوکم ئەکەمەوە . دایە کەمێك باسی باوکمم بۆ بگێڕەرەوە .

ـ چیت بۆ بگێڕمەوە . هەرچی بوو بۆمگێڕایتەوە .

- ئەمجاریش بۆم بگێڕەرەوە !
پوورە ( زارا ) ی وتی :
- ئەیەوێ باسی باوکی بۆ بگێڕیتەوە . خۆی لەبیری نی یە .
( کوردە ) وەڵامی دایەوە :
- وەڵاڵ لەبیرمە .
- چیت لەبیرە ؟ کە باوکت چوو بۆ ناوچەی جەنگ ، تۆ هێشتا شیرەخۆرە بوویت .
( کوردە ) سواری کەللەڕەقی یەکەی بووەوەو وتیەوە :
- لەبیرمە ، لەبیرمە . لەسەر قەرەوێلەکەم نووستبووم ، باوکم هات باوەشی پیاکردم ، هەڵی بڕیم و تێر ماچی کردم .
پوورە ( زارا ) ی وتی :
- هیچت لەبیر نی یە . ئەوکاتە هێشتا تەمەنت لە سێ هەفتە تێنەپەڕیبوو .
- نەء . کە باوکم گەڕایەوە لە مەیدانی شەڕ یەك ساڵان بووم !
- ڕاستە . تیپەکەی باوکت بە شارەکەی خۆمانا تێئەپەڕی ، باوکت چەند دەقیقەیەك لای دایە مـــاڵ . بەڵام دایکت ئەوەی بۆ گێڕاویتەوە . ( کوردە ) خۆی تووڕە کردو وتی :
- هیچ وا نی یە ! خۆم زۆر باش لەیادمە ، خەوتبووم باوکم هات بێداری کردمەوەو ماچێکی کردم . پاڵتۆیەکی سەربازانەی زبری لەبەرابوو . پاش ئەوە ڕۆیشت . ئیتر هیچی‌ترم لەیاد نەماوە .
- منالی یەك ساڵان شتی‌وای ناکەوێتە بیر کە پێشان ڕووی‌دابێ لێی .
( کوردە ) قوڕگی پڕ بوو لە گریان . بەدەم هەنسکەوە وتی :

ـ من لەبیرمە . توخوا دایە لەبیرم نی‌یە ؟ بابزانین دایکم ئەڵێ چی ؟

دایکی وتی :

ـ دیارە ڕۆڵە لەبیرتە . مادەم لەبیرت بێ باوکت پاڵتۆیەکی زبری لەبەرابوو دیارە هەموو شتێکت لەبیرە .

ـ ئەرێ وەڵڵا دایە گیان ! پاڵتۆکەی زبر بوو ، زۆر باشم لەبیرەو مادەم باوکم لە جەنگا کوژراوە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە .

( کوردە ) ئەو ئێوارەیە بەدوای ئەم بیرەوەری‌یانەیدا حـــوڵ بووبوو ، نەمتوانی ئەوەی ئەمویست پێی بڵێم ، گەڕامەوە بۆ ماڵ .

ئەوشەوە خەو نەچوە چاوم ، هەر بیرم لە ( کوردە ) ئەکردەوە . ئاخ خۆزگە قوتابی‌یەکی هـــەوڵدەر بوایە ، هیچی لێ نەئەقەومـاو یەکێکی وەك خـۆمی لێ دەرئەچو . منیش پێشان ئیشم نەئەکرد ، بەڵام پاشان بەگەرم دەســم کرد بە ئیش و بە مرازی خۆم گەیشتم . دیارە شتەکە بۆ من ئاســانترە تا بۆ ( کوردە ) ، چونکە من باوکم هەیە ، هەمیشە هەوڵم ئەدا بزانم ئـەو چی ئەکا تا منیش چاو لەو بکەم . بەڵام ( کوردە ) باوکی نی‌یە . هێشتا منداڵ بوو ، کە باوکی لە جەنـگا کوژرا . بە گەرم ئەمویست یارمەتی‌ی ( کوردە ) بدەم ، لە دڵی خۆما ئەموت ئەگەر هەوڵم لە گەڵ بدایە ئەیتوانی لە دەرسی ڕووسی‌یشا خۆی پێش‌خاتەوەو ببێ بە قوتابی‌یەکی تێکۆشەر .

زۆرم بیر لێ کردەوە . پاشان بڕیارمدا هەمـوو ڕۆژێ دەرسی ڕووسی‌یەکەی پێ ڕەوان کەم ، بەڵام لێـکم‌دایەوە بەر لەوەی بێتەوە بۆ قوتابخانە هەرچی لەگەڵ بکەم بێسوود ئەبێ ، ئـەی چۆنی بگێڕمەوە بۆ قوتابخانە ؟ لام وابوو هەرچی ئەڵێم هەمووی بە هیـچ دەرئەچێ ، چونکە کابرایەکی تەواو نی‌یە . تا ئێستاش نەی‌وێراوە پێی

لێ نێ بۆ دایـکی که چی ئه‌کا .

مه‌سه‌له‌که ئاشکرا بوو : ئه‌بێ له‌گه‌ڵی توند بم . سبه‌ینێ که له قوتابخانه گه‌ڕامه‌وه ئه‌چمـه لای به هه‌مـوو توندو تیژی‌و وردیه‌ك قسه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌که‌م. ئه‌گه‌ر نه‌هاته سه‌ر ئه‌وه قسه بۆ دایـکی بکاو نه‌یـیـست بگه‌ڕێته‌وه بۆ قوتابخانه هه‌ڕه‌شـه‌ی لێ ئه‌که‌م که‌وا ڕاستی لای ( ئاواز خان ) ئه‌ڵێم و ئیتر پشتی نا گرم، چونـکه ئه‌م پاساودان‌و پشت‌گرتنه ڕۆژ به ڕۆژ زیانی زیاتر پێ ئه‌گه‌یه‌نێ . ئه‌گه‌ر تێش نه‌گات من بۆ قازانجی ئه‌ومه، چش با لێم تـووڕه بێ ! چاوه‌ڕوانی ئه‌که‌م تا ئه‌مه به‌سه‌ر ئه‌چێ ، پاشان تێ‌ئه‌گا له‌وه زیاتر هیچم پێ نه‌ئه‌کرا. ئه‌مجار وه‌ك جاران ئه‌بینه‌وه به براده‌ری به‌وه‌فـای یه‌کتر . دانی ئه‌م بڕیاره کوتووپڕ وای‌لێ‌کردم مه‌سه‌له‌که به‌سووکتر سه‌یر که‌م . هه‌ستم به‌شه‌رمه‌زاری کرد که‌وا تا ئیستا هیچم بۆ دایـکم نه‌گێڕاوه‌ته‌وه . ئه‌مویـست کورج هه‌ڵسم هه‌موو شتێکی بۆ بگـێڕمه‌وه . به‌ڵام وه‌خت دره‌نـگ بوو ، ماڵه‌وه‌مان هه‌موو دابوویانه پڕخه‌ی خه‌و .

# بەشی پانزەهەم

سبەینێم بەجۆرێکی وا لێ بەسەرچو. خۆم چاوەڕوانیم نەئەکرد . ئەمویست کە لە قوتابخانە گەڕامەوە بڕۆم چو. بە ( کوردە ) بکەوێو بۆ جارێ دوایی قسەیەکی ڕاستو ڕەوانی لەگەڵ بکەم . بەڵام لە قوتابخـ بە قوتابی‌یەکانم وتبوو کەوا (کوردە نەخۆشـــە ، لەبەرئـەوە هـــەمو. قوتابی‌یەکانی تیپـەکەمان بڕیاریان ـ بڕۆن بۆ سەر لێدانو هەواڵپرسیو. کە دەرس دوایی هـات قـولم لێ هەڵکردو بە هەڵەداوان چوو. بۆ ماڵیان پێ‌ی‌بڵێم کەوا قوتابی‌یەکان دێن بۆ لای . هەر کـ دیمی وتی :

— نازانی ؟ توانیم قاچی خۆم بەحەواوە ڕاگرم ! ئەبێ لەپـ دیوارەکەدا ڕاوەستم ســەر بنێمە زەوی‌و قـاچم پاڵ بدەم بە دیوارەکەوە .

پێم وت :

— جارێ واز لەوە بێنە . ڕاکە ناو جێگەکەت .

— بۆ ؟ چی‌یە ، چی قەوماوە ؟

— چونکە نەخۆشی !

— نەخۆشی چیم ؟

— لەسەر داوای خۆت بە قوتابی‌یەکانم وتووە نەخۆشی .

— ئێ ؟

— ئێستاش هەموو ئاوەڵەکان دێن بۆ سەر لێ دانت .

— توخوا درۆ ناکەی ؟

دەس‌بەجێ خۆی کرد بەناو جێگەکەیا ، تەنانەت بە بێ‌ئەوەی قزندەرەکەشی داکەنێ‌و جلەکانی بگۆڕێ . لێفەکەشی دا بەسەریا . جا لێی‌پرسیم :

— کە هاتن چی‌یان پێ بلێم ؟

— بلێ نەخۆشم . لەوە زیاتر چی ئەلێی ؟

دوابەدوای ئەوە ئاوەڵەکان هاتن . پاڵتۆکانیـان لە دالانەکەدا داکەندو کردیانن بەدارا ، جا خۆیـان کرد بەژوورا . ( کوردە ) لێفەکەی هێنابوە سەر دەمی . سەرنجێکی پەشێوی تێ‌کرتن . ئاوەڵەکان پێ‌یان وت :

— مەرحەبا ( کوردە ) :

وەڵامی دانەوە :

— مەرحەبا سەرچاو ، برادەرینە !

دەنگی ئەوەندەی دەنگی نەخۆشێکی ڕاستەقینە کز بوو .

( یاوەر ) وتی :

— هاتووین بۆ هەواڵ پرسیت .

— سوپاستان ئەکەم کورینە ، بـەخێر بێن . وەرن دانیشن

تۆزێك بحەسێنەوە ٠ (ئازاد) لێی پرسی :

— باشە ، ئیستا چۆنی ؟

— وەڵڵا بڵێم چۆنم !

— هەمیشە هەر لەناو جێگەدای ؟

— ئەوەتەم لە بەرچاوتا ٠

( بەختیار ) وتی :

— ئەگەر هەر بکەوی بێتاقەت ئەبێ ٠

— دیارە ٠

— بەدرێژایی ڕۆژ بەتەنهای ؟

— ئەرێ وەڵڵا تەنها خۆمم ٠ دایکم ئیش ئەکاو پووریشم لە خوێندنگایە ٠

— لەئیستا بەدواوە زۆر زۆر دێین بۆ ســەر لێدانت ٠ نابێ گلەییمان لێ بکەی کە پێشان نەهاتووین ٠ وامان ئەزانی زوو چاك ئەبیتەوەو دێیتەوە بۆ قوتابخانە ٠

— گوێ مەدەنێ کوڕینە ٠ ( شاخەوان ) هەموو ڕۆژێ ســەرم لێئەدا ٠

( سۆران ) لێی پرسی :

— ئەی حەز ناکەی ئێمەیش هەموو ڕۆژێ بێین سەرت لێبدەین ؟

— بە خێر بێن بەسەرچاو ٠٠

دیارە پێی نەئەکرا بڵێ « حەز ناکەم » :

( یاوەر ) لێی پرسی :

— کوێت دێشێ ؟

— هەموو گیانم ٠ شانم ، قۆڵم ، قول و قاچم ٠

— قاچیشت ؟
— ئەتانەت سەریشم !
— هەمیشە لەشت ژان ئەکا ؟
— هەمیشە نا ، ئێشەکە ئەڕواو دێتەوە .
( جوامێر ) وتی :
— منالێکیش لە ماڵی ئێمەیە هەموو لەشی هەمیشە ئێش ئەکا . ڕۆماتیزمیەتی .. ڕەنگە تۆیش هەر ڕۆماتیزمت بێ !
— ڕەنگە بێ !
( ئازاد ) لێی پرسی :
— ئەی دوکتۆر ئەڵێ چی ؟
— ئەتەوێ بڵێ چی ! هەمیشە هەر ئەمەیە : « زمانت دەربێنە ! هەناسە بدە .. بکۆکە ! » .
— ئەی ناڵێ نەخۆشی یەکەت چی یە ؟
— وابزانم ئەڵێ .. ڕیخۆڵە کێرەیە .
— چی ؟ ڕیخۆڵەکێرە ؟
( کوردە ) شانێکی لەقاندو وتی :
— منیش نازانم !
— ئەی بە چی تیمارت ئەکا ؟
— بە دەرمان .
— چ دەرمانێك ؟
— دەرمانێکە ناوەکەی نازانم .
— تامی چی ئەدا ، شیرینە ، تاڵە ؟
— ئۆی ، کە تاڵە !

( کوردە ) ڕووی خۆی توندو کرژ ئەکرد وەك بڵێی خەریکی خواردنی دەرمانەکەیە !

( دڵخواز ) وتی :

— کە منیش نەخۆش بووم دوکتۆر دەرمانێکی تاڵی ئەدامێ ، بەڵام من نەم‌ئەویست .

— منیش دەرمانەکەی خۆمم ناوێ .

— بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئەبێ بیخۆیتەوە تا زوو چاك بیتەوە .

— ئەی‌خۆمەوە .

( بەختیار ) وتی :

— گوێ مەدەرە تاڵی . بیخۆرەوەو پاشان کوڵۆیەك شەکر بنێرە دەمت .

— چاکە !

— جا کە چاك بوویتەوە دەرسەکانی ئەم چەند ڕۆژەت بۆ دێنین‌و یارمەتیت ئەدەین تا پیاماندا بکەیتەوە .

— وەی ! چۆن پیاتانا ئەکەمەوە !

لەوکاتەدا سەرنجم‌دا تاکێك لە قژی ( کوردە ) لەژێر لێفەکەیەوە دەرکەوتووە . حەپەسام . ترسام یەکێك لە ئاوەڵەکان بیبینێ . بەڵام باش‌بوو ئەوان سەریان قاڵ بوو بە قسەکردنەوە لەگەڵی . چاویان پێ‌نەکەوت . بە هێواش لێی نزیك بوومەوەو لێفەکەم کێشایەوە بەسەر پێ‌یاو ، وتم :

— کورینە ، ئەزانن نەخۆشە . نابێ ماندووی بکەن . هێشتا چاك نەبوەتەوە .

منالەکان دەسیان‌کرد بە ماڵاوایی لێ کردنی :



ـــ به دوعا ! زوو چاك بەرەوە ! سبەینێیش دێین بۆلات .

ئەوان ڕۆیشتن‌و ( کوردە ) لێفەکەی لەسەر خۆی فڕێداو ڕاست بووەوە . لە خۆشی‌یاندا کەوتبوە سەما کردن‌و هاواری ئەکرد :

ـــ شتێ چاك بوو ! هەستیان بە هیچ نەکرد . مەسەلەکە بە ئارەزووی دڵی خۆمانە !

پێم‌وت :

ـ پێویست ناکا دڵی خۆت خۆش کەی . ئەمەوێ قسەیەکی ڕاست‌و ڕەوانت لەگەڵ بکەم .

ـ لەبابەت چی‌یەوە ؟

ـ لەبابەت ئەوەوە کە ئەبێ بێیتەوە بۆ قوتابخانە .

- ئەزانم ، بەڵام ئیستا چۆن ئەتوانم ؟ تۆ بە چاوی خۆت ئەبینی . .

- هیچ نابینم . ئیتر ئەمە ئاخر جارە . بڕیارم داوە سبەینێ نەیەیت بۆ قوتابخانە بە ( ئاواز خان ) ئەڵێم کەوا نەخۆش نیت .

سەری لەم قسەیەم سوڕ ما ، لێی پرسیم :

- بۆ ؟

- چونکە ئەوەندەی پێویست بوو حەسایتەوە . ئیتر ئەبێ ئیش بکەی . لێم ئاشکرایە نابی بە پاڵەوان .

- بۆ نابم بە پاڵەوان ؟ بڕوانە چۆن بووم . ئەتوانم لاقم بەحەواوە ڕاگرم .

نزیکی دیوارەکە بووەوەو لەسەر دەست ڕاوەستا . کوتوپڕ دەرگا کرایەوەو ( بەختیار ) خۆی کرد بەژوورا !.. ( بەختیار ) وتی :

- دەسکێشەکانم لەبیرچووە . ئای . . ئای .. ئەمە چی‌یە ؟

( کوردە ) ئەمە خۆتی خۆت هەڵواسیوە بە دیوارا ؟

( کوردە ) بە سەرسامی‌یەوە هەڵسایەوە سەر پێ . (بەختیار) وتی :

- ئەمەبوو نەخۆشەکەمان !

( کوردە ) وتی :

- بەشەرەفم نەخۆشم . لە شەرمەزاریدا سوور هەڵگەڕابوو ، دەسی کرد بە نکەنکو بە شەلەشەل چووەوە بۆ سەر جێگەکەی .

- بەسە ، بەس بە درۆ خۆت نەخۆش بخە . تۆ لای خۆت ئەڵێی شانو قۆڵو قاچو قوڵم ئێش ئەکا ، کەچی وا بە سەر ئەڕۆی بە ڕێدا .

- بەشەرەفم ، نەخۆشم !

- کەم درۆ بکە . ئەی چۆن وا کورج جلەکانت لەبەرکرد ؟

دیارە هەر بەم جلانەشەوە لەناو جێدا کەوتبووی . وا نی یە ؟

ـ باشـە . قسەیەکت پێ ئەڵێم ، بەڵام سـوێندم بۆ بخۆ ئەی‌گێڕیتەوە بۆ کەس .

ـ سوێند لەسەر هیچ ناخۆم !

ـ کەواتە منیش قسەت بۆ ناکەم !

لەم‌کاتەدا ترپەی پێ‌یەك هات لە دالانەکەدا . دەرگا کرایەوەو ( ئازاد ) سەرێکی کێشایە ژوورەوەو وتی :

ـ زووکە ( بەختیار ) بێ بە رێدا ، چاوەڕوانتین !

ـ وەرە وەرە ( ئازاد ) .. وەرە ئێرە . ئەزانی ؟ ( کوردە ) ئەوەندەی تۆسقاڵێك نەخۆش نی یە !

ـ نەخۆش نی یە ؟

( ئازاد ) بەتەواوی سەرسام بوو . هاتە ژوورەوە . ( یاوەر ) لە دالانەکەوە هاواری کرد :

— کێ نەخۆش نی یە ؟

ئەویش خۆی کرد بەژووراو هەموو ئاوەڵەکانی‌تر بەدوایەوە .

( بەختیار ) وەڵامی دایەوە :

— ( کوردە ) نەخۆش نی یە .

— چۆن نەخۆش نی یە ؟

— چۆن چۆن ! هاتمە ژوورەوە سەیر ئەکەم سەری ناوەتە سەر عەرزو لاقی کردووەتە حەواو قنج ڕاوەستاوە !

ئاوەڵەکان پرسی‌یان :

— ئەمە چی‌یە ؟ بۆچیمان هەڵ‌ئەخەڵەتێنی ؟

( کوردە ) ویستی پاکانە بۆ خۆی بکاو خۆی بپەرێنێتەوە :

— ئیتر وابوو برادەرینە ! گاڵتەم ئەکرد !

— گاڵتەی و! چەند قۆڕو بێ‌تامە !

— ئیتر ئەوەبوو ! ئەمەی وت و باڵی فش کردەوە ! وەك بڵێی بیەوێ مەسەلەکە ڕوون بکاتەوە .

( ئازاد ) وتی :

— ئێمە دڵمان لە مەراقا بوو بۆی . قوتابی‌یانی تیپەکەمان هەموو هاتن بۆ هەواڵ پرسیێ ! کەچی سەیر ئەکەین ئەم هەتیوە کەرە درۆمان لەگەڵ ئەکاو بە درۆ خۆی نەخۆش خستووە .

( کوردە ) لەژێر لێوەوە وتی :

— لەمەولا نەیبینن برادەرینە ! جارێکی‌تر شتی وا ناکەم .

( یاوەر ) لێی‌پرسی :

— ئەی بۆ نایەیت بۆ قوتابخانە ؟ ناشێ خۆت بۆ ئەوە کردبێ بە نەخۆش نەیەی بۆ قوتابخانە ؟

— بۆتان ڕوون ئەکەمەوە برادەرینە ! بەڵام ئەبێ تووڕە نەبن . نەم‌ئەویست فێڵتان لەگەڵ بکەم . بڕیارم دابوو لە سێرکا ئیش بکەم .

— لە سێرکا ؟

— ئا ! تا ببم بە پاڵەوان .

— تۆ شێتی ؟

— نەوەڵڵا هیچ شێت نیم .

( ئازاد ) لێی پرسی :

— کێ وەرت ئەگرێ لە سێرکا ؟

— بۆچی لات وایە هونەرمەندی سێرك لەکوێوە دێنن ؟

— ئەچیتە سێرك ، قەید ناکا . بەڵام بۆ قوتابخانە بۆ نایەیت ؟

— نامەوێ لەمە زیاتر بخوێنم . هەموو شتێ ئەزانم !

— چۆن هەموو شتێ ئەزانی ؟

— هەرچی بۆ هونەرمەندی سێرك پێویست بێ ئەیزانم !

— ناشێ لاتوابێ ئەبێ نەخوێندەوار بی تا بێ بە هونەرمەندی سێرك ؟

— بۆ نەخوێندەوارم ؟ ئەوەندە فێر بووم بەسم بێ !

— چی فێر بووی ؟ تۆ وا لەوێ نووسین نازانی ! بێەوێ بچیتە قوتابخـــانەی سـێرك ئەبێ خوێنـدنی قوتابخـانەکەت دوایی بێنی . هونەرمەندی سێرکیش پێویستی بە خوێنـدن هەیە . ئەبێ پرس بە ( ئاواز خان ) بکەی . ئەمە قسەی ( یاوەر ) بوو .

( کوردە ) ش وەڵامی دایەوە ؟

— پرسی پێ ناوێ . خۆم ئەزانم ( ئاواز خان ) ئەڵێ چی !

( ئارام ) وتی :

— برادەرینە ! ئەمە هەمووی کەریەتی‌و قسـەی قۆڕە . ئەبێ هەموو ئـەم شـتانە لە یادی خۆی بەرێتـەوەو سـبەینێ بێت بۆ قوتابخانە .

( یاوەر ) وتی :

— ئەگینا هەموو شتێ بۆ ( ئاواز خان ) ئەگێرینەوە !

( کوردە ) وتی :

— جا ئەبێن بە فیتنەو قسەبەر !

( یاوەر ) وەڵامی‌دایەوە :

— مادەم پێشان پێمان وتووی ، هیچ نابین بە فیتنەو قسـەبەر !

( ئارام ) یش دوابەدوای ئەو وتی :

— تۆ ئازای سـبەینێ مەیە . بەشی خۆت حەسابێتـەوە . ئیتر ئەبێ بکەویتەوە ئیشر !

لەمکاتەدا گوێمان لە ترپەی پێیەك بوو لە دالآنەکەدا ! درا لە دەرگا ! ( کوردە ) لەجیاتی ئەوەی بە دەم تەقەکەوە بڕوا ، چوو وەك مشك خۆی کرد بە ناو جێکەکەیداو لێفەکەی دا بەسەریا !
دەرگا کرایەوە سەیر ئەکەین ( ئاواز خان ) ە هاتووە !
کە کردی بە ژوورا وتی :
— ئای هەموو ئەندامانی تیپەکە لێرەن ! ئەوە هەموو هاتوون بۆ سەردان لە ئاوەڵە نەخۆشەکەتان ؟
کەس وەڵامی نەدایەوە ! چونکە کەسمان نەمانئەزانی بڵێین چی ؟
( کوردە ) زەق زەق ئەیڕوانی بۆ ( ئاواز خان ) و لێفەکەی توند ڕائەکێشا بەسەریا وەك بڵێی بییەوێ خۆی بشارێتەوە ! ( ئـــاواز خان ) لێی نزیك بووەوەو لێیپرسی :
— ( کوردە ) ئەوە نەخۆشی ؟ کوێت دێشێ ؟
( یاوەر ) وتی :
— نەوەڵڵا نەخۆش نییە !
— چۆن ؟
- هیچ نەخۆش نییە !
( کوردە ) تێگەیشت کە فێڵی بەدەستەوە نەماوە . لێفەکەی لەسەر خۆی فڕێداو لەسەر قەرەوێڵەکـــەی دانیشتو چاوی بڕییە زەوی . ( ئاواز خان ) سەیرێکی هەموومانی کرد . منی دی ، لێی پرسیم :
( شاخەوان ) ، ئەی بۆچی پێتوتم ( کوردە ) نەخۆشە ؟
لە ڕووزەردیدا نەمئەزانی خۆم چۆن ڕاگرم !
- بڵێ ... وەڵامم بدەرەوە ! بۆچی ڕاستت پێ نەوتم ؟

- ئاوانی من نی‌یە ، ئەو داوای لێ کردم دەنگ نەکەم .
- ( کوردە ) داوای لێ کردی فێڵم لێ بکەی ؟
لەژێر لێوەوە وتم :
- ئا ...
- تۆیش فێڵت لێ کردم ؟
- بەلێ ، فێڵم لێ کردی .
- وایشت ئەزانی شتێکی باشت کردووە ؟
- بەڵام مادەم ئەو داوای لێ کردم ...
- لات وایە کە منت ئەخەڵەتاند خزمەتت بەو ئەکرد ؟
- نەء .
- ئەی بۆ وات کرد ؟
- چونکە لام وابوو نابێ ڕاستی ئاوەڵی خۆم بلێم !
- نابێ ڕاستی ئاوەڵی خۆت بلێی ؟ نابێ ڕاستی ئاوەڵێ خۆت بە دوژمن بلێی . بۆچی من دوژمنی تۆم ؟
نەم ئەزانی چۆنی وەڵام بدەمەوە . سەرم شۆڕ کردو بێ دەنگ دەسم کرد بە سەیری بەردەمی خۆم . ( ئاواز خان ) لەسەر قسەی خۆی ڕۆیی ، وتی :
- وام نەئەزانی قوتابی‌یەکانم بە دوژمنی خۆیانم ئەزانن !
( ئازاد ) هەڵی دایە ، وتی :
- شتی وا ڕاست نی‌یە . ئێمە قەت تۆمان بە دوژمنی خۆمان نەزانیوە !
- ئەی بۆچی کەستان قسەتان بۆ نەکردم ؟
- تا ئەمڕۆ کە هاتین بۆ ئێرە کەسمان نەیزانیوە ( کوردە ) نەخۆش نی‌یە .
- باشە ، پاشان باسی ئەمە ئەکەین .. ( کوردە ) بۆچی نەئەهاتی

بۆ قوتابخانە ؟

( کوردە ) لەژێر لێوەوە وەڵامی دایەوە :

- ئەترسام .

- لەچی ئەترسای ؟

- ئەترسام داوای پسوولەم لێ بکەی .

- پسوولەی چی ؟

- پسوولەی دایکم ، چونکە ڕۆژی دەرسی نووسین نەهاتم .

- ئەی ڕۆژی دەرسی نووسین بۆ نەهاتی ؟

- ئەترسام .

- لەچی ئەترسای ؟

- لە پلەی خراپ !...

- کەواتە ڕۆژی دەرسی نووسین بە دەستەنقەست نەهاتی پاشانیش بۆیە نەهاتی چونکە دایکت پسوولەی نەدایتێ ؟

- بەڵێ ، ڕاستەکەی ئەمەیە .

- بەڵام کە بڕیارت دا نەیەیت بۆ قوتابخانە ، خەیاڵت بوو چی بکەی

- نازانم !

- هیچت بە خەیاڵا نەهات ؟ بڵێ !

- ئۆی ! .. لەو بیرەی بە خەیاڵما هاتبوو !

( یاوەر ) وتی :

- ویستوویە ببێ بە پاڵەوانی سێرک .

( ئاواز خان ) وتی :

- بتەوێ لە قوتابخانەی سێرکدا وەرت بگرن ، ئەبێ خوێندنی سەرەتایی تەواو کەی ، پاشان پێنج ساڵی تریش بخوێنی . هەر لەخۆتەوە نابی بە هونەرمەندی سێرک .

- نەخێر نابم !

ـ ورد بەرەوە ! بێ ئەوەی بیر لە هیچ بکەیتەوە ، ڕۆژێکیان لەخـۆتەوە بڕیارتدا نەگەڕێیتـەوە بۆ قوتابخانەو ئیتر نەهاتیتەوە . شتیوا بە عەقڵی کێـدا دێ ؟

( کوردە ) وەڵامی نەدایەوە .

ـ پێم بڵێ ئەی ئیستا بەتەمای چی بکەی ؟

ـ نازانم .

ـ باشە ، بیرکەرەوە !

ـ تاوێك بێدەنگ بوو ، پاشان بە سەری دانەویوەوە سـەیرێکی ( ئاواز خان )ی کردو وتی :

ـ ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانە .

ـ ئەمە باشترین شتێکە بیکەی ، بەڵام بـە مەرجێ گفتم بدەیتێ ڕەوشتی خۆت بگۆڕیو ببی بە قوتابییەکی باش . ( کوردە ) وتی :

ــ بڕیار بێ ئەبم بە قوتابییەکی باش .

ــ ڕۆڵە گیان ! کوڕم بۆ شل کە ! سبەینێ دێیت بۆ قوتابخانەو منیش داوا لە بەڕێوەبەر ئەکەم ڕێگات بداتەوە بخوێنی .

ــ دێم .

( ئاواز خان ) داوای لە ئێمەش کرد بڕۆینەوە بۆ ماڵی خۆمانو ئیشەکانی قوتابخانەمان جێبەجێ بکەین . ( کوردە ) کـە دی ( ئاواز خان ) نیازیوایە بمێنێتەوە ، پێیوت :

ــ بەڵام مامۆستا تکات لێ ئەکەم هیچ بە دایکم نەڵێی !

ــ بۆ ؟

ــ ئەبم بە قوتابییەکی باش ، بەڵام تۆ هیچ بەو مەڵێ !

ــ واتە ئەتەوێ بەردەوام بی لە هەڵخەڵەتاندنی دایکتداو ، سەرەڕای ئەوە ئەتەوێ پشت بە منیش ببەستی یارمەتیت بدەم لەم

نیشەدا .

— جارێکی‌تر فێڵ لە دایکم ناکەم ، بەڵام نامەوێ دڵیشـی لێم بێشێ .

— ئەی ئەگەر زانی کە هەردوکمان فێڵمان لێ کردووە ، دڵی زیاتر نایەشێ ؟

— ڕاستە وایە . .

— کەواتە ئەبێ بۆی بگێڕینەوە . مادەم تۆش گفتت داوە لەمەولا هەول بدەی‌و تێبکۆشی و باش بخوێنی ، داوای لێ ئەکەم زۆر لێت عاجز نەبێ .

— گفتت ئەدەمێ . .

— کەواتە وا ڕێ‌کەوتین . دەی کتێبەکانت هەڵگرە با پێکەوە خەریکی دەرسەکانت ببین .

منیش لەگەڵ ئاوەڵەکانما چوومە دەرەوە . ئیتر نەمزانی پاش ئەوە چی ڕوویدا .

# بەشی شانزەهەم

بۆ سبەینێ ( کوردە ) هات بۆ قوتابخانە . کەمێك تێکچووبوو . هەندێك بە شلەژاوی یەوە سەیری ئاوەڵەکانی ئەکرد . بەڵام کە دیتی کەس بەسەریا نایەت و خراپەی نالێ ، دامرکایەوەو دڵی هێمن بووەوەو لای منا دانیشت . ئیتر وەك جاران لام چۆڵ نەمایەوە . بەوە زۆر دڵشاد بووم . وەك بڵێی دڵیشم جێگای خاڵی تیا نەمابێ و هەموو شتێ ڕێك و پێك بووبێتەوە .



( ئاواز خان ) یش هیچی نەوت . بە عادەتەکەی خۆی دەرزی وتەوە . لە پشووی پاش دەرزدا ( کامەران ) هات و ئاوەڵەکان دەسیان کرد بە گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی ( کوردە ) بۆی . لام وابوو کەمێ سەرزەنشتی ( کوردە ) ئەکا ، بەڵام لەجیاتی ئەو سەرزەنشتی منی کرد . پێی وتم :

— تۆ ئەتزانی ئاوەڵەکەت بەهەڵەدا چووە . بۆچی یارمەتیت نەدا بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکەی ؟ ئەبوو قسەیەکی بەڕاستی لەگەڵ بکەی . جا ئەگەر گوێی نەدایتێ بە مامۆستا یا بە من یا بە ئاوەڵەکانت بڵێی ، کەچی تۆ لەجیاتی ئەوە بۆت داپۆشیوە .

— ڕەنگبێ وابزانی هیچ قسەم لەگەڵ نەکردووە ! چەند جار

هەولم لەگەڵ داوە ، بەڵام هیچم پێنەئەکرا ، چونکە ئەو خـۆی بڕیاری دابوو نەیەتەوە بۆ قوتابخانە .

— بۆچی بڕیاری دابوو ؟ چـونکە پلەکانی ( خراپ ) بوون . بەڵام تۆ هەرگیز یارمەتیت داوە تا پلەی ( چاك ) وەربگرێ ، یـا نەت ئەزانی پلەکانی ( خراپ )ن ؟

— ئەمزانی . هەموو ئەمەی لەسایەی دەرزی ڕووسی یەوە تووش هات . هەمیشە دەرزی ڕووسی یەکەی لەسەر کتێبەکەی مـن ئەنووسی یەوە .

— دیت ؟! ئەگـەر تـۆ چاکەیت بویستایە ، نەت ئەهێشت دەرزەکەی لەســـەر کتێبەکەی تۆ بنووسێتەوە . بنیادەم ئەگەر بەڕاستی دۆستی یەکێك بێ ، ئەبێ لەگەڵی توند بێ و چاو لە هەڵەی نەپۆشێ . ئەگەر وانـەبوو بۆ ئەوە ناشێ بە دۆسـتی دابنرێ . ئەمە دۆستایەتی ی ڕاستەقینە نی یە . دۆستایەتی یەکی ساختەیە .

هەموو قوتابی یەکان دەسیان کرد بە سەرزەنشت کردنی من ، پێیان ئەوتم تۆ دۆسـتێکی باش نیت . ( کامەران ) پێشنیاری بۆ کردم کەوا :

— کە لێبووینەوە لە دەرز ، دیسانەوە کۆئەبینەوەو باسی ئەم مەسەلەیە ئەکەینەوە .

بڕیار وابوو هەر پاش لێبوونەوە کۆبینەوە ، بەڵام (ئاواز خان) من و ( کوردە ) ی بانگ کردو پێی وتین :

— ( کوردە ) و ( شاخەوان ) ! بەڕێوەبەر چاوەڕوانتانە ، ئەیەوێ قسەتان لەگەڵ بکا .

دڵم داخورپا . پرسیم :

— ئەیەوێ قسەی چیمان لەگەڵ بکا ؟

ــ قسەتان لەگەڵ ئەکا .. زووکەن ، بڕۆن .. مەترسن !

چووینە ژووری بەڕێوەبەر . لای دەرگاکەدا وەستاین و وتمان :

ــ ڕۆژباش ( مامۆستا گۆران ) !

( مامۆستا گۆران ) لەسەر مێزەکەی خۆی دانیشتبوو ، خەریکی نووسینی شتێ بوو نەمزانی چی‌یە ؟

لەسەر نووسینەکەی خۆی ڕۆیی ، بەڵام وەڵامی ئێمەشی دایەوە :

ــ چۆنن کوڕەکانم ! وەرنە ژوورەوە ، لەسەر ئەو قەنەفەیە دانیشن .

ترساین دانیشین ، چونکە قەنەفەکە زۆر لە بەڕێوەبەرەوە نزیك بوو ، هەرلای دەرگاکەدا وەستاین . وامانئەزانی ئەوە مەترسی‌ی کەمترە . ( مامۆستا گۆران ) کە لە نووسینەکەی بووەوە ، چاویلکەکەی لەسەر چاوی لابردو لێی‌پرسین :

ــ بۆ هەر وەستاون ؟ وەرن دانیشن !



نزیك بووینەوەو دانیشتین . قەنەفەکە ڕوویەکی چەرمی پێوەبوو بریقەی ئەدایەوە . چەرمەکە ئەوەندە لووس بوو هەمیشە لەوانە بوو قنگم هەڵخلیسکێ‌و لێی بکەومە خوار چونکە لەسەر لێوارەکەی

دانیشتبووم . نەم ئەتوانی وەك پێویستە وادانیشم . تای کاتێ کە قسەی بۆ ئەکردین من چەندم خەفەت ئە خوارد . قسەکەی زۆر درێژەی کێشا . بە دانیشتنەکە زیاتر ماندوو ئەبووم لەوە کە بەپێوە ڕاوەستم . کە دانیشتین ( مامۆستا گۆران ) پرسی :

ـــ دەی ڕۆلە ( کوردە ) بۆم بگێرەرەوە بۆچی لە قوتابخـانە ڕات کرد ؟

( کوردە ) نەی وێرا قسە بکا ، وتی :

ـــ نازانم !

( مامۆستا گۆران ) وتی :

ـــ ناشێ ؟ ئەی لات وایە کێ ئەزانێ ؟

( کوردە ) لەژێر لێوەوە وتی :

ـــ نازانم !

ـــ ڕەنگ بێ وابزانی من ئەزانم ؟!

( کوردە ) بە قنگی چاو بۆی ڕوانی بزانێ ئاخۆ گاڵتە ئەکا یا بەڕاستیەتی ، بەڵام بەرێوەبەر بەڕاستی بوو . ( کوردە ) وەڵامی دایەوە :

نازانم ، مامۆستا !

ـــ کوڕم ، گوێت لێ بێ . ئەمـــە شێوەی وەڵامدانەوە نی یە هەرچەند من لێت بپرسم تۆ هـــەر بڵێی « نازانم » ! کە قســـە بکەین با بەڕاستی قسە بکەین . من وەنەبێ لەخـۆڕایی لێت بپرسم . بۆچێ خۆت لە قوتابخانە ون کرد ؟

( کوردە ) وەڵامی دایەوە :

ـــ ئیتر وابوو ، ئەترسام !

ـــ لە چی ئەترسای ؟

— له دەرزی نووسین . پێشان خۆم لەو دەرزە ون ئەکرد ، ئەوجا ترسام ( ئاواز خان ) داوای پسووڵەم لێ بکا لە دایکمەوە . لەبەر ئەوە ئیتر نەهاتم .

— لەبەرچی لە دەرزی نووسین ئەترسای ؟ شتێکی بەسامە ؟

— ئەترسام پلەی ( خراپ )ی تیا وەربگرم !

— واتە دەرزی ڕووسی یەکەت باش فێر نابی ؟

— نەخەیر .

— بۆ باش فێری نابی ؟

— زەحمەتە ، تێی ناگەم .

— لە دەرزەکانی تریشتا هەر وای ؟

نەء ، ئەوان کەمێك ئاسانترن .

— ئەی ئەم بۆچی گرانە لات ؟

— خەتای خۆمە . نازانم وشەکان چۆن ئەنووسرێن .

— کەواتە ئەبێ چاری ئەو خەتایەی خۆت بکەی . وادیارە کە ئەچیتەوە بۆ ماڵ ئەوەندەی پێویستە خەریکی دەرزی نووسین نابی .

— نەخەیر .

— بۆ ؟

— بۆم ناکرێ . دەرزی جوگرافیاو مێژوو تەنها یەك جار ئەیانخوێنمەوە فێریان ئەبم ، کەچی هەر کە دەس ئەکەم بە دەرزی نووسین گورج لێم تێك ئەچێ .

— ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە پێویستە زۆرتر بە دەرزی ڕووسی یەکەتەوە خەریك بی . نابێ تەنها لە دەرزە ئاسانەکانا سەرکەوی . ئەبێ لە دەرزە گرانەکانیشا سەرکەوی . ئەگەر بتەوێ فێر ببی ، ئەبێ هەوڵ بدەی .

ئەنجا لای‌کردەوە بە لای منداو وتی :

( شاخەوان ) پێم بڵێ تۆیش پێشان لە دەرزی ژمارەدا لاواز نەبووی ؟

— بەڵێ مامۆستا ! لە دەرزی ژمارەدا لاواز بووم .

— ئەی ئێستا ، لە جاران باشتر نیت ؟

— بەڵێ ئێستا لە جاران باشترم .

— چۆن باشتر بووی ؟

— ویستم‌و بووم . ( ئاواز خان ) پێی‌وتم ئەبێ بمەوێ . منیش ویستم‌و هەوڵم‌دا سەرکەوم .

- سەریش‌کەوتی ؟

- بەڵێ سەرکەوتم .

- ڕەنگ‌بێ پێشان تۆزێك ناڕەحەت بووبی ؟

- بەڵێ لە سەرەتادا زەحمەت بوو ، بەڵام ئێستا وام لێ‌هاتووە بەتەنها خۆم خەریکی دەرزەکانم ئەبم .

- ( کوردە ) دیت ، تۆیش چاو لە ( شاخەوان ) بکە . لە سەرەتادا مەسەلەکە کەمێك زەحمەت ئەبێ ، بەڵام پاشان کە ئاسانت کرد ئیتر بەتەنها خۆت ئیش ئەکەی . بەڕاستی دەس پێ‌بکە هەمووشتێ بە مرازی دڵی خۆت ئەڕوا .

( کوردە ) وتی :

- هەوڵ‌ئەدەم .

( مامۆستا گۆران ) وتی :

- هەر ئەوەندەت لە دەس دێ بڵێی هەوڵ ئەدەم . ئەبێ دەس بدەیتێ . مەسەلەکە بەم‌جۆرەیە .

( کوردە ) وتی :

ـ باشه ! تاقی ئه‌کەمەوه !

ـ بەزمه‌کەی جارانه . . تاقی ئه‌کەمەوه ! چەند منالێکی بێ‌کارمو هیچ‌لێ‌نەهاتووی ! له چی ئەترسی ؟ برادەرت نی‌یه ؟ یارمەتیت نادەن ؟ ( شاخەوان ) تۆ برادەری ( کوردە ) نیت ؟

وەڵامم دایەوه :

ـ بەڵێ مامۆستا برادەریمی !

ـ ئەی بۆ یارمەتی‌ی نادەی تا باری دەرزی نووسینەکەی ڕاست کاتەوه ؟ زۆر لەم دەرزەیدا دواکەوتووه . بەتەنها ناتوانێ چاری بکا .

وتم :

ـ ئەتوانم یارمەتی‌ی بدەم . من خۆیشم پاشکەوتوو بووم ، ئەزانم بنیادەم ئەبێ چۆن خۆی له پاشکەوتن ڕزگار کا .

( مامۆستا گۆران ) زەردەخەنەیەکی کردو وتی :

— زۆر چاکه . . زۆر چاکه . ئەنجا وتی :

— تۆیش ، پاشان ، هەوڵ ئەدەی ؟

وتم :

— نەخەیر ، من پاشان هەوڵ نادەم ! من هەر لەئێستاوه دەس پێ ئه‌کەم .

( مامۆستا گۆران ) وتی :

— ئافەرین ، ئاوا ئەبێ . ئەمەته شتی چاك . زۆرم پێ‌خۆشه . ئەرێ تۆ هیچ ئیشێکی گشتی‌یان نەداوه بەسەرتا ؟

— نەخەیر ، مامۆستا !

— زۆر چاکه . کەواته ئەمەی که پێت‌ئەڵێم یەکەمین ئیشه که دەستی ئەدەیتێ . لەگەڵ ( ئاواز خان ) یش قسەم‌کرد ، وتی تۆ ئەتوانی یارمەتی‌ی ( کوردە ) بدەی . ئەوەی تۆ پێت‌ئەکرێ بۆ خۆتی

بکەی ، ئەتوانی بۆ کەسێکی تریشی بکەی . بەڵام ئەمە ئیشێکە ئەبێ بەڕاستی بکرێ .

— بەڕاستی ئەکرم .

— سەرپەرشتیی ئەوە ئەکەی کە ( کوردە ) لەکاتی خۆیا بەدەستی خۆی دەرزەکانی بنووسێتەوەو ئەوەی دەسی ئەداتێ تەواوی بکا . نابێ لەجیاتیی ئەو هیچ بکەی . وابکەی چاك ناکەی لەگەڵی . ئەگەر بتوانی فێری ئەوەی بکەی خۆی بۆخۆی ئیش بکا ، ئەیکەی بە خاوەنی عەزیمەت کە ئیستا بێبەشە لێی . ئیتر لەوەوپاش پێویستی بە تو نابێ . حاڵی بووی ؟

— حاڵی بووم .

— ( کوردە ) تۆیش ئەبێ زۆر باش بزانی هەرکەس ئیشێکی کرد پێویستە بەڕاستی بیکا .

( کوردە ) لەژێر لێوەوە وتی :

- بەڵام خۆ من هێشتا نەکەوتوومەتە ئیش !

- چۆن نەکەوتوویتە ئیش ؟ ئەی خوێندنەکەت ؟ خوێندن بە ئیش نازانی ؟ ئیشی تۆ خوێندنە . خوێندن لە هەموو ئیشێ باشترە . گەورەکان لە کارگەو کێڵگەی میریو کێڵگە هەرەوەزییەکانا ئیش ئەکەن ، ئێسگەی کارەبا دروست ئەکەن ، کارێز لێئەدەن ، ڕووبارو دەریاکان بەیەکەوە ئەبەستن ، ئاو ئەگەیەننە دەشتو بیابانەکان ، دارستان ئەنێژن . لەکورتی بیبڕینەوە ، ئەزانن ئیشیان چییەو ئەبێ چیبکەن . منداڵانیش لە قوتابخانەکانا ئەخوێنن تا ببن بە پیاوی ڕۆشنبیرو ئەوانیش سبەینێ بە هەموو توانایان خزمەتی نیشتمانەکەیان بکەن . تۆ ناتەوێ خزمەتی نیشتمانەکەت بکەی ؟

- بێ گومان ئەمەوێ !

- ڕەنگبێ وابزانی هەر ئەوەندە مەبەس بێ بڵێی « ئەمەوێ » ؟ ئەبێ ئازایەتیو خۆڕاگرتنیشت ببێ ، ئەگینا نابی بە هیچ .

- لە ئیستا بەدواوە خۆم ڕائەگرم !

- ئەمەتە شتی چاك ! ئەبێ مــەردیش بی . لەمەوپێش مــەرد نەبووی . فێڵت لە دایکتو مامۆستاتو ئاوەڵەکانت ئەکرد .

- لەئیستا بەدواوە مەرد ئەبم !

- ( مامۆستا گۆران ) وتی :

- هەوڵبدە مەرد بی . وەنەبێ ئەمــەش هــەموو شتێ بێ . ئەبێ ئاوەڵەکانیشت خۆش بوێ .

( کوردە ) لەم قسەیە سەرسام بوو . وتی :

- بۆچی ئاوەڵەکانم خۆش ناوێ ؟

- نەخەیر ! بەجێتهێشتن تا وازیان لێ بێنی . دۆستایەتی کەی وائەبێ ؟

ئەوەندەی نەمابوو فرمێسك بپەڕێتــە چاوی ( کوردە ) . هاواری کرد :

— بەڵام زۆر بێتاقەت بووم بۆیان !

— شتێکی جوانــە بێتاقەت بووبی بۆیان ، بەڵام لەوە جوانــتر ئەوەتە تێ بــگەی ناتوانی بێ هــاوڕێکانت بژیتو هەرگیز بەخەیاڵتا نەیەت بەجێیان بێڵی .

( کوردە ) وتی :

— لەمەوپاش زۆرترم خۆش ئەوێن .

لێرەدا ( مامۆستا گۆران ) لێی پرسی :

— ئیستا ، کوڕی باش ، بۆم بگێڕەرەوە بەدرێژایی ئەم ڕۆژانە کە نەئەهاتیتە قوتابخانە چیت ئەکرد ؟

بۆمان گێڕایەوە کە چۆن ویستمان لۆپزێك فێری ژمارە کردن بکەین . زۆری ئەهمیەت بەوە داو داوای لێ کردین بەدرێژی باسی ئەوەی بۆ بگێڕینەوە . کە لێبووینەوە وتی :

ــ کەواتە لەوباوەڕەدان ئەتوانرێ سەگێ فێری ژمارە کردن بکرێ ؟

وەڵامان دایەوە :

ــ ئەی سەگەکەی لە سێرکەکەدا دیمان چۆن ژمارەی ئەزانی ؟

مامۆستا دەسی کرد بە پێکەنین و وتی :

ــ ئەویش نازانێ . تەنها فێری وەڕین بووبوو . کە ئیشارەتیان بۆ ئەکرد لە وەڕین ئەکەوت . سەگێ کە چەند جارێك ئەوەڕێ کابرای مەشق پێ کەر ئیشارەتێکی بۆ ئەکا کەس پێی نازانێ . ئەویش لە وەڕین ئەکەوێ . بەڵام خەڵکەکە هەموو وائەزانن سەگەکە لەخۆیەوە ئەوەندەی ئەو ژمارەیەی پێویستە ، ئەوەڕێ .

( کوردە ) پرسی :

ــ ئیشارەتەکە چی یە کە مەشق پێ کەرەکە ئەیکا ؟

ــ یا سەری ، یا دەسی ئەلەقێنێ ، یا وائەبێ بە تەقاندنی پەنجەکانی بەئاستەم ئیشارەتی بۆ ئەکا .

بەڵام ( کوردە ) کورج ، وەك بەرپەرچی قسەکەی ( مامۆستا کوران ) بداتەوە ، وتی :

ــ بەڵام لۆپزیکی ئیمە جارجار بێ ئەوەش ئیشارەتی بۆ بکەین بێ هەڵە ئەژمێرێ .

ــ سەگێ کیانێکی سەیری سەرنجدانی هەیە . لەوانەیە لەوکاتەدا کە ئەو ئەوەڕێ تۆ سەرت بلەقێنی ، یا بەئاستەم جووڵەیەك بکەی

خۆت پێی نەزانی و ، ئەو بەو سەرەلەقەیە یا ئەو جوولەیە لە وەڕین بکەوێ ، وا تێبگا واتە بەس . جا وائەبێ سەرەلەقەکە یا جوولەکەی تۆ لەوکاتەدا ئەبێ کە ئەو ئەوەندەی پێویست وەڕیوەو ژمارەکەی تەواو دەرئەچێ . وایش ئەبێ پێش یا پاشـــی ئەوە ئەبێ و بەهەڵەدا ئەچێ . بۆیەش زۆرتر وایە بە هەڵەدا ئەچێ . بۆئەوەی وەڕەی سەگەکە ئەوەندەی وەڵامی ڕاستی پرسیارەکە بێ ، ئەبێ ئیشارەتێکی تایبەتی ی فێر بکرێ و هەمیشە ئەوەی پیشان بدرێ وەك پەنجە تەقاندن .

( کوردە ) وتی :

— تاقی ی ئەکەمەوە . بەڵام جارێ خەریکی دەرزی ڕووسی یەکەم ئەبم . کە چاری دواکەوتوویی یەکەی خۆمم کرد ، ئەوســـا دەس ئەکەم بە مەشق کردن بە اۆپزیك .

— زۆر باشە . کە ئاهەنگێکیشمان گێڕا لە قوتابخانەدا ، ئەتوانن سەگە زاناکەتان بێنن پیشانی قوتابی یەکانی بدەن .

زۆر ئەترساین ( مامۆستا گۆران ) سزامان بدا ، بەڵام مامۆستا نیازی ئەوەی نەبوو . هەر ئەوەندەی ئەویست پێمان بڵێ ئەبێ ببین بە دوان لە قوتابی یە چاکەکان .

## بەشی حەڤدەهەم



کە لە ژووری بەڕێوەبەر هاتینەدر ئەبینین وا ( کامەران ) و هەموو ناوەڵەکان لە دالآنەکەدا وەستاون چاوەڕوانی ئێمەن . دەس بەجێ دەوریان داین و دەسیان کرد بە پرسیار لێ کردنمان :

ــ ( مامۆستا گۆران ) چی پێ وتن ؟ سزای چی بۆ دانان ؟

وەڵامم دانەوە :

ــ سزا نادرێین . لێمان خۆش بوو .

( ئاشتی ) ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو ، وتی :

ــ بە خوا مشەیە ! دە یەڵلا زووکەن با بڕۆین بۆ هۆڵی وردیلە پێشەنگەکان و دەس کەین بە قسە . قسەی زۆرمان پێیە . بە چەند تاقم یەك لەدوای یەك چووینە هۆڵەکە . ( کوردە ) دوا کەس بوو هاتە ژوورەوە .

( یاوەر ) بانگی کرد :

ــ ( کوردە ) وەرە ، مەترسە ! کەس لۆمەو سەرزەنشتت ناکا .

لە دەوری مێزێك دانیشتین . ( کامەران ) وتی :

ــ کوڕینە دەس کەن بە قسە . بزانم چۆن یارمەتیی (کوردە)

ئەدەن . ( کوردە ) لەمەوبەر باش نەی ئەخوێند ، تا وای لێ هات دەسی لە قوتابخانە هەڵگرت . تاوانی ئەمەش لە ئەستۆی هەموو لایەکماندایە . ئێمە کاتی خۆی سەرنجمان نەئەدا چۆن ئیش ئەکا . لەکاتی پێویستدا یارمەتیمان نەدا .

پاش ئەو ( ئازاد ) وتی :

-- بەڵێ وایە ، خەتای ئێمەشی تیایە . بەڵام پێویستە ( کوردە ) خۆی تێ بگا ئەبێ لەمەوپاش لە جاران باشتر بخوێنێ . ئەگەر هەر لە ئیستاوە تێ هەڵ نەچێ ئەنجامی باش نابێ .

( یاوەر ) رووی کردە ( کوردە )و پێی وت :

-- راست ئەکا ، خۆیشت دڵگران مەکە . ئەگەر باش نەخوێنی لەوانەیە ئەوەی پێشان رووی دا دووبارە ببێتەوەو ئەنجامی خراپ بێ . بەڵام ئێمە یارمەتیت ئەدەین . گفتی پیاوی مەرد بێ چەند پێویست بێ هەوڵت لەگەل بدەین .

( بەختیار ) پرسی :

-- یارمەتی ی ئەدەین ؟ چۆنی یارمەتی ئەدەین ؟ هاورێیەکی بۆ دیاری کرابوو یارمەتی ی بدا . وادیارە ( پشکۆ ) ئەوەندەی گوێ نەداوەتێ ، ئەگینا ئەنجامی وا نەئەبوو !

( کامەران ) لە ( پشکۆ )ی پرسی :

-- رەنگە بێ هیچت بۆ نەکردبێ !

( پشکۆ ) وەڵامێ دایەوە :

-- چۆن هیچم بۆ نەکردووە ؟ پێکەوە ئیشمان ئەکرد !

-- چەند جار پێکەوە ئیشتان کردووە ؟

-- لە یادم نەماوە ، دوو جار .. سێ جار ..

( یاوەر ) سەرسام بوو :

ـ دوو جار .. سێ جار ..؟ بەڵام بڕیار وانەبوو تەنها دوو جار سێ جار لەگەڵی خەریك بی . تۆ لە کۆبوونەوەکەدا گفتتدا هەموو ڕۆژێ لەگەڵی خەریك بی . ئێمەش کە ئەم ئەرکەمان خستە سەرشانی تۆ متمانەمان پێت کرد ، کەچی تۆ متمانەکەی ئێمەت دا بە ئاوا ..

( پشکۆ ) خۆی تووڕە کرد ، وتی :

ـ پێم نەئەکرا . هەرچەند ئەچووم بۆ ماڵیان ئەبینم یا لەوێ نی یە یا ئەڵێ « ئەمڕۆ تاقەتم نی یە » . منیش وەڕز بووم ..

( یاوەر ) وتی :

ـ دیت؟ لەجیاتی ئەوەی مەسەلەکە بخەیتە بەردەستی تیپەکەمان تا لێی بکۆڵێتەوە ، وازت لێهێناو بەجێتهێشت . تۆ خۆت قوتابی یەکی تێکۆشەری و باش هەوڵ ئەدەی ، بەڵام نەتویست یارمەتی ی برادەرێکت بدەی تا ئەویش فێر ببێ وەك تۆ ئیش بکا . خۆ تۆ ئەتزانی ( کوردە ) شڵو شێواوەو ڕێكوپێکی نازانێ . قەیدی نی یە ، با وا بێ ! خەتای منە ، ئەبوو منیش ئاگاداری ی تۆ بکەم بزانم چۆنی لەگەڵ ئەجووڵێیتەوە .

( پشکۆ ) وتی :

ـ لەمەوپاش باش ئاگاداری ی ئەکەم و خەریکی ئەبم . ئەمە هەموو خەتای شەترەنج کردن بوو ..

( کامەران ) وەڵامی دایەوە :

ـ نەخەیر جارێکی تر ئەم ئیشە ناسپێرینەوە بە تۆ .

منیش وتم :

ـ لەمەوپاش من لەگەڵی خەریك ئەبم ، ( مامۆستا گۆران ) پێی وتم لەمەوپاش تۆ لەگەڵی خەریك بە .

( کامەران ) بەوە ڕازی بوو ، وتی :

-- باشـە ! مادەم ( مامۆسـتا گۆران ) وتوویە ، ئێمەش هەڵتەبژێرین . ڕازین کوڕینە ؟

هەموو بە یەك دەنگ هاواریان کرد :

-- ڕازین . مادەم ( مامۆسـتا گۆران ) وتوویە ، با لەگەڵی خەریك بێ .

کە لە کۆبوونەوەکە بووینەوە چووینە دەرەوە بۆ سەرجادە . لە سەرەتادا ( کوردە ) بەڕێوە هیچی نەوت ، هەر بیری ئەکردەوە . زۆری بە بیر کردنەوەوە پێچوو . دوایی وتی :

- نەمئەزانی من کوڕێکی ئەوەندە خراپم ! تۆسـقاڵێك عەزیمەتم نی‌یەو بۆ هیچ دەس‌نادەم ! ناتوانم لە هیچ شـتێکا سەرکەوم . هەرچەند ئاسانو بێ بایەخیش بێ ! ..

ویستم دلی بدەمەوە . پێم‌وت :

-- بۆچی ؟ هیچ وا نی‌یە ! کوڕێکی خراپ نیت .

-- دەنگ مەکە . من خۆم ، خۆم باش ئەناسـم . بەڵام نامەوێ لەمەوپاشیش وابم . ڕەوشـتی خۆم چاك ئەکەم . ئەیبینی . بڕیاری مەرد بێ ئەبێ ڕەوشتی خۆم چاك‌کەم . تۆ هەر ڕووخۆش بە لەگەڵم‌و یارمەتیم بدەو هەقت نەبێ . ( مامۆسـتا گۆران ) پێی‌وتووی ئەبێ یارمەتیم بدەی ، ناتوانی دەس‌بەردارم بی .

-- دەس بەردارت نابم ، بەڵام ئەبێ تۆیش گوێم بۆ شل‌کەی . لەمڕۆوە دەس‌ئەکەین بە ئیش . پاش قاوەاتی کـردن دێم بۆلاتو دەس پێ‌ئەکەین .

کە نانی نیوەڕۆم خوارد دەس‌بەجێ چووم بۆ ماڵی ( کوردە ) . کە بە پلەکانەکانا سەرئەکەوتم وەڕەی سەگێـکم بەرگوێ کەوت .

چوومە ژوورەوە ئەبینم لۆپزیك لەسەر کورسی‌یەك دانیشتووە ئەوەڕی،
(کوردە) یش لەولاوە لەبەر پۆزیا پەنجە ئەلەقێنێ . پێی‌وتم :
- سەیرکە ! وا کە ( مامۆستا گۆران) پێشانی‌داین ، فێرم کرد
کە ئیشارەتم بۆ کرد حاڵی ببێ وبەکـــویتم بکا . وەرە با تۆزێ
لەگەڵ لۆپزیك خەریك بین ، ئەوجا دەس بە ئیشەکانمان ئەکەین .
هەرچۆن بێ ئەبێ مەشقی پێ‌بکەین .
- گیـانە ، تۆ گفتتدا تا ناتەواوی‌ی دەرزی ڕووسی‌یەکەت
چار نەکەیت ، خـەریکی لۆپزیك نەبێ . ناشێ پەشیمان بوویتەوەو
بیرت گۆڕیبێ ؟
( کوردە ) هاواری کرد :
- برایەوە ! چغە لۆپزیك ، چغە ! تا چاری ناتەواوی‌ی دەرزی
ڕووسی‌یەکەم نەکەم بۆی ناڕوانم . ئەگەر دیت جارێکی‌تر لەگـەڵ
لۆپزیك خەریك بووم ئیزنت بێ پێم بڵێ کابرایەکی بێ‌کارەی .
پێشان دەس بە کام دەرز بکەین ؟
- دەرسی ڕووسی .
- ئەی بۆ پێشان دەس بە جوگرافیا یا ژمارە نەکەین ؟
- نابێ ! من تاقیم کردووەتەوە ئەبێ لەپێشا دەس بە چـی
بکرێ . باسی چیمان بەدەستەوەیە لە ڕێزمانا ؟
- باسی تیپەکانی جووڵەمان بە دەستەوەیە . ( ئاواز خان )
پێی‌وتم ئەبێ تەماشـــای پەیرەوی تیپـەکانی جـــوولە بکەمەوەو
پرسیارێکی داومەتێ وەڵامی بدەمەوە .
- کەواتە با لەمەوە دەس پێ بکەین !
- باشە ، با لەمەوە دەس پێ بکەین !
- دە بەتەنها خۆت دەس پێ بکە ، بەتەمای ئەوە مـەبە من

پرسیارەکەت بۆ لێکدەمەوە . ئەبێ خــۆت لێکی بدەیتەوە . منیش سەیری ئەکەم بزانم تەواوە . ئەبێ فێر ببی خـۆت بە خـۆت ئیش بکەی .

(کوردە) هەناسەیەکی هەڵکێشاو کتێبەکەی بەدەستەوە گرت وتی :

ـ باشە ! . .

بە پەلە چاوێکی بەپەیرەوەکەدا گێڕا و دەسی کرد بە لێکدانەوەی پرسیارەکە . شتێکی ئاسان بوو . ئەبوو نموونەکان بنووسێتەوەو تیپە ناتەواوەکانیان بۆ دانێ . بێوەستان ، ئەینووسی . منیش لەماوەیەدا سەیری کتێبی جوگرافیاکەم ئەکرد ، خۆم وا پیشان ئەدا کە ئاگام لەوە . کە لێبووەوە هاواری کرد :

ـ دوایی هات !

سەیرم کرد . . ئەبینم پڕە لە هەڵە . ئەی خــوا ! هەڵەی لە ژمارە نایەت . لەبریتی ( کـەو ) نووسیویە ( کو ) و لەبریتی ( هەورامان ) نووسیویە ( هورمان ) .

پێم‌وت :

ـ گیانە ، ئەمە چیت کردووە ؟

ـ هەڵەی زۆری تیایە ؟

ـ یەکجار زۆر نی‌یە ، بەڵام نایش‌توانین بڵێین کەمە !

ـ دیت ؟ خۆم زۆر باش ئەمزانی هەرگیز تیا سەرناکەوم !

عەزیمەتی شکاو ورەی بەردا . پێم‌وت :

ـ ئەمەمان مەبەست نی‌یە . ئەبێ فێری ئەوە ببی ئەم وشانە چۆن ئەنووسرێن . پەیرەوەکە فێر بوویی ؟

ـ ئەی چۆن ؟

ـ ئەڵێ چی ؟

ـ پەیڕەوەکە ؟.. لەیادم نەماوە !
ـ ئەی چۆنت خوێندەوە ئەگەر لەیادت نەماوە ؟
ناچارم‌کرد دیسانەوە بیخوێنێتەوە . پاشان پێم‌وت :
ـ تۆ نووسیوتە ( کو )و ( هورمان ) . بۆچی وات نووسیوە ؟
ـ باشە ، ئەی ئەبێ بنووسم ( کاو )و ( هاورەمان ) ؟
ـ جارێ نەتەوێ بەگۆترە شت بزانی . هەرشتێك پەیڕەوێکی هەیە ، ئەبێ بەکاری‌بێنیو بەپێی ئەوە بنووسی . پەیڕەوێکمان بەدەستەوەیە ئەوەتە ئەگەر تیپی دەنگ ( سەر ) یکی کورتی هەبوو ( هێ )یەك و ئەگەر ( سەر ) یکی درێژی هەبوو ( ئەلف ) یك بەدوایا دێت . ئەم ( هێ )یەو ئەم ( ئەلف )ە پێیان ئەوترێ ( تیپی جوولە ) .
— کەواتە ئەنووسین ( کەو ) و ( هەورامان ) !
زۆری پێ خۆش‌بوو کە فێری ئەمە بوو .
جا پێم‌وت :
— وایە . زانیوتە . جا ئەمجاریش پرسیارەکە بنووسەرەوە . چونکە ئەوجار بێ بەکارهێنانی پەیڕەوەکە وەڵامت دایەوە . لەبەرئەوە کەڵکی نەبوو . ئەبێ بیر لەو جووڵەیە بکەیتەوە وا بە هەر تیپێکی دەنگەوە .
— باشــە . ئەمجارەی دێ لێی ورد ئەبمەوە . ئێستا بـا هەر وا بێ .
— برام ، نابێ ! کفتت داومەتێ چیم پێوتی بەگوێم بکەی .
(کوردە) لووتێکی هەڵقرچاندو دیسانەوە پرسیارەکەی نووسی‌یەوە . بــەڵام زۆر پەلەی ئەکرد ، تیپەکانی لارووێر ئەنووسی‌د دێڕەکانی بەم‌لاو بەولادا ئەبردو ئەیدان بەسویەکدا . دیار بوو بێزار بووە !

زۆری پێنەچوو ( یاوەر )هات . کە دیمانی لە کۆڕی ئیش کردناین ، وتی :

— وادیارە ، خەریکن . شتی چاکە . ئەوە چی ئەکەن ؟

وتم :

— ( ئاواز خان ) پرسیارێکی داوە بەسەر (کوردە)دا خەریکی لێکدانەوەی ئەو پرسیارەین .

سەیرێکی دەفتەرەکەی کردو وتی :

— ئەنووسی چی ؟ ئەبێ ( سەر )ی ( بێ )ی ( شارەبان ) بە ( ئەلف ) بنووسی .

— چۆن ئەبێ بە ( ئەلف )ی بنووسم؟ ئەمیش وەك ( دارەبەن ) وایە . ورد بەرەوە ، سەیرکە تەزانەت لە کتێبەکەشا نووسراوە ( دارەبەن ) !

( یاوەر ) وتی :

— تۆ چیتە بە دارەبەنەوە ؟ تەماشای پەیرەوەکەی خۆت بکە : ئەگەر تیپی دەنگ (سەر)ێکی درێژی هەبوو بە (ئەلف) ئەنووسرێ . تاقی بکەرەوە بزانە خەڵك ئەڵێن ( شارەبەن ) یا ( شارەبان ) ؟

— هیچ وانییە . (شارەبەن)یش وەك (دارەبەن) وایە .

— ئاخر تۆ ورد بەرەوە خەڵك کەی (شارەبان)و (دارەبەن) وەك یەك ئەڵێن ؟ لەویانا (بێ)کە درێژ ئەکەنەوە ، کەچی لەمیانا لەسەری ئەوەستن .

— ڕاستە وایە .

— کەواتە ئەبێ بنووسی ( شارەبان ) !

لەم مشتو مڕەدا بووین (ئازاد) هاتو دی خەریکی هەوڵدانین .
وتی :

— خەریکن ؟
— ئەی ، خەریکین !
— ئافەرم ! سبەینێ قوتابی‌یانی پۆلەکەمان هەموویان سوپاستان ئەکەن .
( کوردە ) وتی :
— هەر ئەمەمان ناتەواو بوو ! هەر قوتابی‌یەك بگری ئیشێکی هەیە بیکا تا دەرسەکەی ڕەوان بکا . ئیتر نە سوپاسی ئەوێو نە هیچ !
— خۆت ئەزانی من لەخۆمەوە وائەڵێم . پۆلەکە ئەیەوێ هەموو کەس ئیش باش بکا . کە ئێوەش ئیش بکەن هەموو شت بە ئارەزووی دڵ ئەبێ .
دیسانەوە دەرگاکە کرایەوە . (جوامێر) خۆی کرد بە ژوورا . ئەویش وتی :
خەریکی ئیشن ؟
— وەڵامم دایەوە :
— چی‌یە ئەمە ؟ هەرکامتان دێو ئەپرسێ : خەریکی ئیشن ؟ وەك بڵێی ئەمە یەکەمجار بێ ئیش بکەین !
( جوامێر ) وتی :
— قسەم لە تۆ نی‌یە . باسی ( کوردە ) ئەکەم !
— بۆچی (کوردە) چی‌یەتی ؟ تائێستا ئیشی نەکردووە ؟ تەنها لە دەرسی ڕووسی‌یدا پاشکەوتووە ، لە هیچ کام لە دەرسەکانی‌ترا پلەی (خراپ)ی وەرنەگرتووە .
— تووڕە مەبە ! لەخۆمەوە واموت . وام‌ئەزانی ئیش ناکا ، ئەوا دیم خەریکی ئیشە .

— قسەیەکی‌تر نەبوو بیکەی ؟ لەم جیهانە فراوانەدا شـــتێکی ترت شك نەبرد بیڵێی ؟

— مەبەستم ئەوە نەبوو دڵتان بێشێنم . شـتێکی وام نەوت دڵتان بێشێنێ .

سەرلەنوێ دەرگاکە کرایەوە . ئەبینم وا (پشکۆ)یش خۆی کرد بە ژوورا . ( کوردە ) بەگوێمیا چپاند :

— سەیرکە ! ئێستا ئەمیش ئەڵێ : « خەریکی ئیشن ؟ » .

( پشکۆ ) لووتی ڕەق نەکردین . زەردەخەنەیەکی کردو وتی :

— خەریکی ئیشن ؟

وەخت بوو لەبەر پێکەنین بپچڕێین :

( پشکۆ ) سەری سوڕ ما . پرسی :

بۆچی پێ‌ئەکەنن ؟ هیچی‌وام نەوت مایەی پێکەنین بێ !

— هیچ . بە تۆ پێ‌ناکەنین . جارێ بۆچی هاتووی ؟

— هەروا ، وتم نەوەك پێویستتان پێم بێ .

لێم پرسی :

— بەڕێکەوت ، شەترەنجەکەت لەگەڵ خۆت نەهێناوە ؟

— ئای ! لەبیرم‌چوو . ئەمانتوانی لێرە چەندمان تاقـەت بێ یـاری بکەین .

( یاوەر ) وتی :

— خۆت‌و شەترنجت بۆ دەرەوە . با بڕۆین کوڕینە ، خەریکیان نەکەین . ئاوەڵەکان هەموو دەرچوون .

( کوردە ) وتی :

— هاتوون بزانن خەریکی ئیشین .

— چی تیایە ، پێویست ناکا زویر ببین !

— لەچی زویر ببین ؟ من وام نەوت . کوڕی باشن ، نایەڵن ئاوەڵێکیان لە دەرسەکانیا بکەوێ .

لە ( کوردە ) م پرسی :

— ئەرێ ئاواز خان بۆ دایکتی گێڕابوەوە کە چەند ڕۆژێك نەهاتووی بۆ قوتابخانە ؟

— بۆ دایکیشم و بۆ پوورە ( زارا ) شمی گێڕابوەوە ! نازانی چییان پێ کردم ! هەر بەتەواوی ڕەزیلیان کردم . سەد سالی‌تر بڕیم لە بیرم ناچێتەوە . گوێ مەدەرێ زۆرم پێ‌خۆش‌بوو مەسەلەکە وا بڕایەوە . ئەو ڕۆژانە کە نەئەهاتم بۆ قوتابخانە دڵم پڕ بوو لە خەم . چەندم بیر ئەکردەوە . سبەینان بیرم لە ئاوەڵەکان ئەکردەوە : ئەموت ئێستا هەڵئەسن بچن بۆ قوتابخانە . ئەوان وەك خەڵکی‌تر خەریکی ئیشن ، کەچی من وەك سەگی خوێڕی ، وەك سەگی بەرەڵلا لە لاڕێکانا کەوتووم . بە جادە و کۆڵانەکانی شارا ئەسووڕامەوە . هەزاران خەیالی نالبار بە مێشکما ئەهات . بەزەییم بە حالی دایکما ئەهاتەوە . نەم‌ئەویست فێڵی لە گەڵ بکەم ، کەچی بەدرێژایی ڕۆژیش فێڵم لێ ئەکرد . هیچ هۆیەك نەبوو لە عاستی خۆما ڕام‌گرێ . دایکانی‌تر شانازی‌یان بە کوڕەکانیانەوە ئەکرد ، بەڵام بەش بە حالی من هیچ هۆیەك نەبوو بۆ ئەوە کەس شانازیم پێوە بکا . ئێش‌و ئازارم دوایی نەئەهات . هەرچەند ئەم وەزعەم درێژەی ئەکێشا ئەنجامی خراپتری ئەبەخشی .

پێم وت :

— سەرنجم نەئەدا وا ناڕەحەت بی . زۆر نەگۆڕابووی !

— ڕاست ئەکەی ، بەڵام باوەڕ کە زۆر ناڕەحەت بووم . دەروونم پڕ بوو لە خەفەت ، هەرچەندیش خۆم بە کەیف‌خۆش

پیشان ئەدا .

— ئەی خۆت بۆ وا پیشان ئەدا ؟

— تۆ هەرچەند ئەهاتی ، دەستت ئەکرد بە لۆمە کردنم . وەك ئەزانی ئەوەش عەیبو شوورەیییەی ئەخستە ڕوو . لەبەر ئەوە ئەبوو خۆم وا پیشان بدەم کە هیچ ڕووی نەداوە . وا ئیستا شوکر ئەوە دوایی هات . ئیتر جارێکی‌تر ناگەڕێمەوە سەری . پێت بڵێم : ئەتوت بەسەر پشتی بەلەمێکەوەم و ڕەشەبایەکی توندیش هەڵی کردووە . بەڵام تازە نە با ماوەو نە بۆران ... ئیستا دڵم شادو هێمنە . هەر ئەوەندەیە ئەبێ هەوڵ بدەم قوتابی‌یەکی تیکۆشەرم لێ دەرچێ .

— هەوڵ بدە !

— لەبەر چاوتە وا دەستم داوەتێ !

# بەشی هەژدەهەم



سبەینێ ( ئاواز خان ) سەیری ڕاهێنانەکەی کرد کە دابووی بە ( کوردە ) لێکی بداتەوە . هەندی هەڵەی تیا دی من پێم نەزانیبوون . ئەو تیپانەی ئەبوو بی یانخاتە جێی خۆیان ، دۆزیبوونیەوە چونکە من هەولم لەگەلی تیا دابوو ، بەلام ڕستەکەی لەخـــۆیەوە نووسیبووەوە . لەلایەکەوە تیپێـکی ناتەواو بـوو . لە لایەکـی تریشەوە وشـــەکەی تەواو نەکردبوو ، یا لەبریتی تیپێکی تیپێکی تری دانابوو . لەجیاتی (ئاوەدان) نووسیبوی ( ئەوەدان ) و لەجیاتی ( پێر ) نووسیبووی ( پیر ) .

( ئاواز خان ) پێی وت :

- ئەمە هی ئەوەیە باش سەرنجت لێ نەداوە . ئەوەش بەهـــۆی ئەوەوەیە کە بەگوێرەی پێویست ئارەزووی ئیش کردنت نی یە . زۆر پەلە ئەکەی ، بەئاشکرا پێتەوە دیارە لە ئەندازە بەدەر پەلە ئەکەی تا ئیشەکانت زوو لەکۆل بیێتەوە .

( کوردە ) وەلامی دایەوە :

- زۆرم پەلە نەکردووە .

- چۆن پەلەت زۆر نەکردووە؟ ئەی بۆچی وا خراپت نووسیوەتەوە ؟ سەیرکە چـــون کۆمەڵێك تیپت لاروویر نووسیوە ؟ کۆمەڵێکیشیان بەرزیو نشێوی‌یان تیایە . ئەگەر ئارەزووت بوایە لەمەت باشـــتر ئەنووسی‌یەوە . ئەو قوتابی‌یەی هەوڵبدا لە ئیشیا نەك تەنهـا نایەوێ هەڵە بێ لە نووسینیا ، ئەشیەوێ خەتەکەی جـوان بێ . باشترە پێی‌لێ‌نێی کە بەڕاستی ئارەزووی ئیش‌کردنت نەبوە .

- وەڵلا ئارەزووم بوو ، بەڵام دەسەڵاتم بەسەر خۆما ناشکێ ئەوەندەی پێویست بێ دانیشم . نازانم بۆ وام ؟ هەمیشە حـــەز ئەکەم زوو لێ‌ببمەوەو دوایی‌بە کار بێنم !

- ئەوە هی ئەوەتە هێشتا تێ‌نەگەیشتووی کەوا بنیادەم بە بێ ئیش ناکا بە هیچ . ئەبێ بەڕاستی ئیش بکەی تا بەسەر خۆتا زاڵ بی و ناتەواوی‌یەکانت چار بکەی .

لەوڕۆژەوە هەرکەس تەماشای دەفتەرەکانی ( کوردە )ی بکردایە بەئاشکرا بۆی دەرئەکەوت چ‌هەوڵێك ئەدا تا بەسەر خۆیا زاڵ بێ . جاری‌وا بوو لە سەرەتاوە بە خەتێکی جـوانـــو ڕێك ڕستەکـەی ئەنووسی‌یەوە . ئینسان هەر حەزی ئەکرد تەماشای بکا . ئەمە نیشانەی ئەوەیە کاتێك کە دەستی پێ‌کردووە عەزیمەتی بووەو ویستوویەتی وا ئیش بکا کە پێویستە . بەڵام وردە وردە خـاو ئەبووەوەو خـەتەکەی ناشـیرین ئەبوو . تیپەکانی تێکەڵی یەك ئەبوونـــو بەسەر یەکا ئەکەوتن و بە ڕاستو چەپا ئەشکانەوە وایان لێ‌ئەهات کەس هیچیان لێ حاڵی نەبێ . جاری‌وایش بـوو پێچەوانەی ئەمە ڕووی ئەدا . لە سەرەتاوە دێڕەکانی تێکەڵو پێکەڵو ناشیرین ئەبوونـــ . دیارە زۆر لێی وەڕز بووەو ویستوویە زوو لێ‌ببێتەوە . بەڵام زۆری پێ‌نەئەچوو

ورده ورده هێزی ئەهاتەوە بەبەراو هەرچەند زۆرتری ئەنووسی خەتەکەی جوانترو ڕێكو پێکتر ئەبوو . کە لێ ئەبووەوە تەواو عەزیمەنی پەیدا کردبوو ئەتوت قوتابی یەکی‌تره هەموو ئەرکەکانی سەرشانی خۆی جێ بەجێ کردووە .

بەڵام شتی گرنك ئەمە نەبوو ، هەڵە کردنەکەی بوو . هەر بەردەوام بوو لە هەڵە کردنا . هەرچەند قوتابی یەکان هەموو لایان وابوو لای کەمی پلەی ( خراپ نی یە ) وەرئەگرێ چونکە ئەیانزانی بەگەرم دەسی داوەتە ئیش ، بەڵام لە دەرزی نووسینا هەر پلەی ( خراپ )ی وەرئەگرت . ئەمە تووشی ناڕەحەتی یەکی زۆری ئەکردین .

ڕۆژێکیان لە پشووی پاش دەرزدا ( یاوەر ) لێ‌ی پرسیم :

- ئەرێ ( شاخەوان ) پێم بڵێ ، ئیستا تۆو ( کوردە ) چۆن ئەخوێنن ؟

- چۆن ئەخوێنین ؟ باش ئەخوێنین !

چۆن باش ئەخوێنن ؟ هێشتا ئەو چاری دواکەوتوویی یەکەی خۆی نەکردووە !

- خەتای من نی یە . من هەموو ڕۆژێ لەگەڵی خەریك ئەبم .

- باشە ، ئەی بۆ هیچ پێش ناکەوێ ؟

- گوناهی من نی یە . هێشتا تەنها چەند ڕۆژێکە دەسمان داوەتێ .

- چەند ڕۆژێکی چی یە ؟ دوو هەفتەیە . وادیارە باش نازانی بیخەیتە سەر سەودای ئیش کردن . ئەبێ بتگۆڕین . داوا ئەکەین لە ( ئاواز خان ) کە ( ئازاد ) ت لە جێ دانێ . ئەو ئەتوانێ بێنێتیە سەر ئەوە باشتر ئیش بکا .

خۆم لێ تووڕە کردو وتم :

ــ بیووره ! من ( مامۆستا گۆران ) داینماوم . لەبەرئەوە ئێوە ناتوانن کەسی‌تر بنێنە جێم !

ــ قەیدی نی‌یە ! سبەینێ بە ( ئاواز خان ) ئەڵێین . ناشێ وابزانی مادەم ( مامۆستا گۆران ) داینماوی ئیتر ناتوانین دەستت لێ بدەین ؟ !

( بەختیار ) وتی :

ــ خۆت تووڕە مەکە . هەرچۆن بێ ( ئاواز خان ) ئەت‌گۆڕێ . تۆ لە ئیشەکەتا سەرنەکەوتی‌و ( ئازاد ) لە تۆ باشتری ئەکا .

( یاوەر ) وتی :

ــ بێ‌گومان لە تۆ باشتری ئەکا .

وتم :

ــ چاومان پێ ئەکەوێ .

ــ مشت‌ومڕی بۆ چی‌یە ؟ ئەیبینین ئەنجام چۆن ئەبێ !

هەندێکی‌تریش لە ئاوەڵەکان وتیان پێویست ناکا من خۆم تووڕە بکەم . بەڵام من وەك ئێستری تۆڕ وابووم لە شاخی شەیتان نەئەهاتمە خوار :

ــ ( ئاواز خان ) خۆی فنیشم نەکا ، دەس لە ئیشی خۆم هەڵناگرم !

ــ ئاخر لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەیە ئەو خۆی فنیشت ئەکا !

نازانم چیم بوو . خۆم ئەمزانی مادەم ( کوردە ) هەر پلەی ( خراپ ) ی وەرگرتووە نابێ ئەوەندە سوور بم لەسەر لەگەڵ خەریك بوونی . لەوانەیە ئەگەر یەکێکی‌تر لە گەڵی خەریك ببێ مەسەلەکە بە بارێکی‌ترا بکەوێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشا هەر بێ‌دەنگ نەئەبووم .

ئەو ڕۆژە منو ( کوردە ) یەکجار پەست بووین . کە لە

قوتابخانه دەرچووینو چووین بۆ ماڵی ئەوان ، پێموت :
— ئەمڕۆ ئاخر ڕۆژە پێکەوە ئیش ئەکەین . لەوانەیە سبەینێ ( ئاواز خان ) بمگۆڕێو یەکێکیترم لەجێ دانێ .
( کوردە ) وتی :
— لەوانەشە نەتگۆڕێ !
— نا ، ئەمگۆڕێ ! هەرچۆن بێ دیارە سوودێکی زۆرم پێنەگەیاندی . دیارە من نازانم فێرت بکەم . ئەوەم پێناخۆشە کە دڵی ( مامۆستا گۆزان ) م خۆش نەکرد ، گفتم دابوویە چاری کەمو کورتیت بکەم ، کەچی ئەوەش ئەنجامی گفتەکەم بوو . ( مامۆستا گۆزان ) پێیوتبووم ئەم ئیشەی ئەیدەم بەسەرتا وایدانێ ئیشێکە بۆ سوودی گشتییە . وا ئیستاکە دەرکەوت نەمتوانی جێبەجێی بکەم ، هیچ بایەخم لای ئاوەڵەکانم نامێنێ .
— ڕەنگبێ خەتای تۆ نەبێ . لەوانەشە گوناهی خۆم بێ ! ئەبوو من خۆم باشتر هەوڵ بدەم . نازانی ؟ ئەمەوێ شتێکت پێ بڵێم تا ئیستا نەتزانیوە : گوناهی خۆم بوو پلەی ( خراپ ) م وەرگرت . بە پەلە ئەمنووسی بۆیە هەڵەی زۆرم ئەکرد . ئەگەر بە پەلە نەمنووسیایە باشتر فێر ئەبووم .
— بۆچی پەلەت ئەکرد ؟
— باشە . شتێکیتریشت پێ ئەڵێم بەوەیشت نەزانیوە : هەمووجارێ ئەمویست زووبەزوو ئیشەکانم تەواو بکەم تا دەس کەم بە مەشق کردن بە لۆپزێك .
— جا مەشقت پێ کرد ؟
— ئا !
وتم :

— ئـەمە بۆیە تیپەکانت ئەوەندە لارو وێر بوون . کاتێـك کە خەریکی نووسین ئەبووی بیرت لە لۆپزیکێ ئەکردەوە نەك لەوەی کە ئەتنووسی .

— بەڵێ ، وایە . ئەمە ڕاستە دڵم لای هەردووکیـان بوو . بۆیەش ئەمە ئەنجامم بوو .

— ئەنجام ! ئەنجام ! نە ئەنجـام هەیەو نە هیچ ! بە دەسێك دوو خەربزە هەڵناگیرێ . ئەبێ تەنها یەکێکیان هەڵگری .

— منیش هەر یەکێکیانم هەڵگرتووە .

— کامیان ؟

— مەشقم بە لۆپزیك کردووە . وەرە سەیرکە . . . لۆپزیك ! کووت ، کووت !

لۆپزیك بە قونەقون هات . ( کوردە ) پارچـە مەقەبایەکی پیشاندا لێی‌نووسرابوو ( ٣ ) :

— لۆپزیك ئەم ژمارەیە چەندە ؟

لۆپزیك سێ جار وەڕی .

— باشە ئەی ئەمە چەندە ؟ ـ ژمارە ( ٥ ) ی پیشاندا ـ

لۆپزیك پێنج جار وەڕی .

ـ دیت ؟ بە عاسـتەم پەنجـەم ئەتەقـاند تا ئاگاداری بکەم بێ‌دەنگ بێ .

— ئەمەت چۆن پێ کرا ؟

— لەسەرەتادا نەی‌ئەویست لە ئیشارەتەکە بگا ، ناچار ئەهاتم ، کە ئەوەندەی پێویست بوو ئەوەڕی ، گورج کولۆ شەکرێك یا پارچە باسـتورمەیەك یا پارچـە نانێکم بۆ فڕێ‌ئەداو پەنجـەمم ئەتەقاند ، دەس‌بەجێ ئەویش پەلاماری ئەو شتەی ئەبردو لە وەڕین

ئەکەوت . چەند ڕۆژ وام لەگەڵ کرد ، پاشان ویستم هیچی بۆ فڕێ نەدەم ، هەر پەنجەم بتەقێنم ، چونکە خووی بەوەوە گرتبوو هەر کە پەنجەمم تەقاند شتێکی بۆ فڕێدەمو بێدەنگ ببێ ، هەرچەند گوێی لە تەقەی پەنجەمەوە ئەبوو بێدەنگ ئەبوو بەتەمای ئەوە کە شتێکی بۆ فڕێدەم . لەپێشا بە دەنگی بەرز پەنجەم ئەتەقاند ، پاشان وردە وردە فێرم کرد کە بەئاستەم پەنجەم بتەقێنم .

وەڵامم دایەوە :

— ئەمەتە هۆی بە هیچ نەبوونت . لەجیاتی ئەوەی بخوێنی مەشقت بە لۆپزیك کردووە .

— ڕاستە هەرچیم کردووە بەپێچەوانەوە کردوومە . من کوڕێکی بێورەم . ئۆی ! ئیتر ! تازە بڕایەوە ! بڕایەوە . ئیستا کە نە مەشق کردن بە لۆپزیك بوومەتەوە ، بەپێی پێویست لە دەرزەکانما هەوڵ ئەدەمو هیچ شتێك نابێ بە کۆسپ لە ڕێما . لەمەولا ئەبینی .

— من مەبەست نیم ببینم ، ( ئازاد ) ئەبێ ببینێ .

سبەینێ ( کوردە ) ڕاهێنانەکانی کە ( ئاواز خان ) دابوویە بێیان نووسیتەوە ، بردنیەوە بۆیو پێشانی دانو وتی :

— ( ئاواز خان ) ئەمە ڕاهێنانەکان کە داتنمێ ، سەیریان کە : لێرەدا باشم نووسیوەو لەویا خراپ . باش ئیشم نەئەکرد ، ( شاخەوان ) ناچاری ئەکردم جارێکی تریش بێیان نووسمەوە . ئەوانەی کە باش نووسیومنەتەوە ئەوانەن کە ئەو ناچاری ئەکردم بێیان نووسمەوە . کەواتە کەس ناتوانێ بڵێ ( شاخەوان ) لەگەڵم خەریك نەبوە .

( ئاواز خان ) وەڵامی دایەوە :

من ئەزانم ( شاخەوان ) چاك لەگەلت خەریك بووە . خۆت ئەبێ باشتر هەول بدەی . ئەبێ لە ئیشەكانتا زیاتر تێ بكۆشی . ( شاخەوان ) یارمەتیت ئەدا ، بەلام ناتوانێ لەجیاتی تۆ بخوێنێ .

ـ خۆم ئەخوێنم ، بەلام بێلە با هەر ( شاخەوان ) یارمەتیم بدا ، وەختێكی زۆرم پێ لەكیس داوە .

— باشە ، با هەر ئەو یارمەتیت بدا . من ئاگام لێیە بە دڵو داییەن لەگەلت خەریك ئەبێ . بەم نزیكانەش پشووی زستانە دێت . یەكەم رۆژی هەردوكتان بێن بۆ لام . هەندێ ئیشت پێ ئەسپێرم و ( شاخەوان ) حالی ئەكەم كە چۆن پێكەوە بی یان كەن تا ئەنجامی باشترتان دەسگیر ببێ .

زۆرم پێ خۆش بوو كە ( ئاواز خان ) وتی رازیمە بەردەوام بی لە هەولدانا لەگەل ( كوردە ) . ( كوردە ) وتی :

— ( ئاواز خان ) ! سەگێكی زیرەكمان هەیە ناوی لۆپزیكە . رازیتە لە ئاهەنگی سەری سالا بیهێنین یاری ی پێ بكەین ؟

— سەگەكەتان چی ئەزانێ ؟

— ژمارە ئەزانێ . وەك سەگەكەی لە سێركەكە دیمان ، ئەزانێ بژمێرێ .

— كێ فێری كردووە ؟

— خۆمان !

— باشە بیهێنن بۆ ئاهەنگی سەری سال . لاموایە قوتابیی یەكان پێیان خۆش ئەبێ بیبینن .

# بەشی نۆزدەهەم



زۆر لەوە پەست بووم کە (کوردە) بە بێ من مەشقی بە لۆریزێك کردبوو ، چونکە زۆرم مەبەست بوو ئاگام لەوە بێ . بەلاّم تازە وا ڕۆیی و خەفەتیش داد نادا . (کوردە) پێی وتم :

— ( شاخەوان ) خەمەخۆ ! جارێکی تر کە سەگێکی خوێریم بەرچاو کەوت بۆت ئەگرم و ئەتدەمێ خۆت مەشقی پێ بکەی .

— بە تەنها خۆم مەشقی پێ بکەم ! ئەوەم پێ خۆش نییە ! کە ئیشێکم کرد حەز ئەکەم برادەرێکم لەگەڵ بێ . بە بێ تۆ خۆم بە سەگەوە خەریك ناکەم .

— منیش یارمەتیت ئەدەم لە مەشق پێ کردنیا . بە هەردووکمانەوە مەشقی پێ ئەکەین . ئەو کاتە تۆیش سەگێکی زیرەکت ئەبێ بۆ خۆت .

— ئەمەش خەیاڵێکی باش نییە ئەگەر سەگێکی تازەمان دەس کەوت ، لەجیاتیی ئەوەی خەریکی ئیشەکانی تۆ ببین ، خۆمان بەوەوە خەریك بکەین . لەمە گەڕێ بۆ هاوین .

— باشە . مادەم ئیستا حەزت لێ نییە با لەمە گەڕێین بۆ

هاوین . بەڵام بە برادەرەکان ئەڵێین هەردوکمان پێکەوە مەشـقی لۆپزیکمان داداوە ، چونکە ڕاستە پێکەوە دەسمان کرد بە مەشـق دادانی . لە ئاهەنگی سەری ساڵیشا پێکەوە پیشانی ئەدەین .

— ئەی ئەگەر لەســەر شانۆکە ترسا ؟ ئەبێ هەر لەئیستاوە ڕای‌بێنین بە بینینی خەڵك .

— چۆن ؟

— بیبەین بۆ جێگایەك خەڵکی زۆری تیابێ . کە لە ئیشـەکانی قوتابخانەمان بووینەوە ئەیبەین بۆ ماڵی ئێمەو لەوێ تاقی ئەکەینەوە بزانین چۆن ئەزانێ بژمێرێ .

کە لێ‌بووینەوە (کوردە) ئەڵقەیەکی کردە مـلی لوپزیکو پەتێکی پێوە بەستو بردمان بۆ ماڵی خۆمان . لەوکاتەدا پوورە (ئەمام)و مامە (سەربەست)م هاتبوون بۆ ماڵمان . پێم‌وتن :

— ئیستا سەگێکی زانانان پیشان ئەدەین . وەك لە شانۆدا دانیشتبن ، دانیشن . باش سەیر کەن . لۆپزیکمان لەسەر کورسی‌یەکی بەرز داناو (کوردە) پارچە مەقەبایەکی لە گیرفانی دەرهێنا ، چەنـد ژمارەیەکی لێ نووسرابوو ، داوای لە لۆپزیك کرد بی‌یان‌خوێنێتەوە . لۆپزیك وا کە پێویست بوو دەسی کرد بە وەڕین . کوتووپڕ خـەیاڵێکی ســەیرم بە بیرا هات . ژمارەم پیشانی لۆپزیك نەدا ، هەر لێم‌پرسی :

— لۆپزیك دوو کەڕەت دوو ئەکاتە چەند ؟

دیارە لۆپزیك چوار جار وەڕی ، چـونکە لەکاتی خـۆیا گورج پەنجەمم تەقاند .

( لاولاو ) زۆری پێ خۆش بوو ، وتی :

— وی ! هەتاوەکو جەدوەلی لێکدانیش ئەزانێ !

دانیشتووەکان هەموو پیرۆزبایی‌یان لێ کردین ، ئێمەش بۆمان باس کردن کەوا لە ئاهەنگی سەری ســالاّ لە قوتابخانە پیشانی قوتابی‌یەکانی ئەدەین • (لاولاو) پرسی :

— ئەی قاتی لۆتی‌یانەتان هەیە ؟

وتم :

— قاتی لۆتی‌یانەمان بۆ شێوا بۆ چی‌یە ؟

( لاولاو ) وتی :

— بێ قات خۆش نی‌یە . دوو دالّفێسی ڕەنگاو ڕەنگتان بۆ دروست ئەکەم . ئیتر کوتومت وەك لۆتی‌ی سەر سێرکتان لێ دەر ئەچێ .

— لە چی بۆمان دروست ئەکەی ؟

— کاغەزی ڕەنگاو ڕەنگم کڕیوە بۆ ڕازاندنەوەی درەختی سەری سال ، لەوە بۆتان دروست ئەکەم .

— مادەم وایە بۆمان دروست بکە . بە دالّفێسەوە جــوانتر ئەنوێنین !

( کوردە ) پرسی :

— ئەی ناکرێ دالّفێسێکیش بۆ لۆپزیك بکەین ؟

— نەء . لۆپزیك بە دالّفێسەوە سەر بە قوڕی پێ دێتە پێکەنین . باشتر ئەوەیە تەوقێکی زێڕینی بۆ بکەین بیکەینە ملی .

وتم :

— باشە ، چی ئەکەی بیکە .

( کوردە ) پێشنیاری کرد :

— با بڕۆین بۆ مالی ( نەوزاد ) ، بەویشی پیشان دەین کە لۆپزیك چۆن ژمارە ئەزانی ؟

چووین بۆ لای ( نەوزاد ). لەوێیشەوە چووین بۆ لای ( یاوەر ) . لای ( یاوەر ) یشـەوە چووین بۆ لای ( ئاشتی ) . لە هەموو لایەك هونەری لۆپزیـکمان پیشـان ئەدا ، ئەوانیش لە بارەقەلاّیی‌دا شـتی خۆشیان ئەدایە . دواجار چووین بۆ ماڵی ( ئازاد ) ، ئەبینین میوانیان هەیە . زۆرمان پێ خۆش بوو ویستمان لەوێیش تۆزێك تاقیی بکەینەوە ، بەلاّم شادی‌یەکەمان بوو بە هیـچ . بەجۆرێك دۆڕاندمان لە ڕووزەردی‌یا نەمان ئەزانی ڕوو بکەیـنە کوێ . لۆپزێك تاقە یەك وەلاّمی ڕاستی نەدایەوە . پاشان بە یەکجاری وازی لە وەلاّم دانەوەش هێنا . لە سەرەتادا بە شان و باڵی خۆمانمانا هەڵ ئەدا و ئەمان وت سەگـێـکی ژمارەزانمـان هەیـە ، کەچی ناچار بووین بە ڕووی زەردەوە ماڵەکە بەجێ بێڵین .

کە گـەیشتینە سەرجادە ( کوردە ) وتی :

— چی‌یەتی ؟ چی تووش هاتووە ؟

پارچەیەك شەکری نایە دەمی ، بەلاّم لۆپزێك بە کەڵبە پـارچە شەکرەکەی شکاندو تفی کردەوە . وتم :

— تێ‌گەیشتم . . . زانیم چی‌یەتی ... ئەوەندەمـان دەرخوارد داوە ئینتیلامان پێ کردووە ، بۆیە نایەوێ وەلاّمێکی ڕاست بداتەوە .

( کوردە ) وتی :

— ئەی ئەگەر لەسەر شانۆی قوتابخانەش هەر وای کرد ، چیمان بەسەردێ ؟ لەبەر دەمی هەموو قوتابخانەکەدا ئابڕوومان ئەچێ . باشتر ئەوەیە خۆمان نەخەینە گەرداوی واوە .

— نابـێ ! تازە دەرفەتمان نەماوە پاشـــگەز ببینەوە . مادام دەسمان داوەتێ ئەبێ تا دوا هەنگـاو بڕۆین .

دوا ڕۆژی پێش سەری ساڵ ( کوردە ) هەر لە بەیانی‌یەوە پەست

بوو ، هەمیشە هەر خەریکی مەشق کردن بوو بە لۆپزیك . پێم وت :

— لە کۆڵی بەرەوە با تۆزێك بحەسێتەوە . تۆ هەمیشە ئەزیەتی ئەدەی تا وای لێ ئەکەی کاتێك کە پێویست بێ وەڵام بداتەوە ، نەی داتەوە .

— باشە ئیتر ئەزیەتی نادەم . چفـە لۆپزیك .. برۆ بۆ خۆت بحەسێرەوە !

وازمان لە لۆپزیك هێنا بروا بۆ خۆی لێی بکەوێ ، دەسمان کرد بە ئامادەبوون بۆ بەزمەکە . ( لاولاو ) دوو داڵفێسی بۆ دروست کردبووین ، یەکێکی شینی ئەستێرە زێوین بۆ من ، یەکێکی سەوزی ئەستێرە زێرینیش بۆ ( کوردە ) . دوو ملەوانی سپی و سەرقۆڵی زەردیشی بۆ کردبووین . تاقیمان کردنەوە ، زۆر دڵمان پێی خۆش بوو . هەر ئەتوت لۆتیی ڕاستەقینەی سێرکین . لۆپزیکیش تەوقێکی زێرینی بۆ کرابوو

کە کاتی ئاهەنگەکە هات لۆپزیکمان بردو چووین بۆ قوتابخانە . لە ماوەی بەشی یەکەمی ئاهەنگە مۆسیقاییەکەدا لەگەڵ لۆپزیك لە هۆڵەکە دانیشتبووین تا بە دیتنی خەڵکەکە ڕابێت . پاشان چووینە پشتی پەردەوە بۆ چاوەڕوانی کردنی هاتنی سەرەمان . بەوجۆرە هەموو شتێکمان دی . پێشان بە داڵفێسەکانمانەوە ئامادە بووبووین . تەوقە زێرینەکەشمان کردە ملی لۆپزیك . پەردە لادرا ، دانیشتووەکان دییان چۆن منو ( کوردە ) بە داڵفێسی سەرمانەوە هاتینە سەر شانۆ . ( کوردە ) لەپێشەوە ئەڕۆیشت ، لۆپزیکیش قونەقون بەدوایەوە ، پەتێکی لە مل کرابوو . منیش بەدوای لۆپزیکەوە بووم ، جانتایەکم بەدەستەوە بوو هەندێ وردە بابەتی تیابوو . (کوردە) لۆپزیکی لە ناوەڕاستی شانۆکەدا و لەسەر کورسییەکی بەرز



دانا • ڕووی کردە خەڵکەکەو وتی :

- دۆستە خۆشەویستەکانم ! ئێستا تەماشای ئەم سەگە زۆرزانە ئەکەن کە ناوی لۆپزیکە ، ژمارە ئەزانێ و ئەتوانێ تا دە بژمێرێ ، بەڵام هێشتا لە خوێندنایە ، کە لەمەوپاشیش فێری زۆرتر بوو پیشانتان ئەدرێتەوە . تکامان وایە هێمن بن ، چونکە ئەمە یەکەمجارە لۆپزیك دێتە سەر شانۆو لەوانەیە لە هەراو بوڵخاخ بترسێ •

دیاربوو ( کوردە ) ترسی لێنیشتبوو ، چونکە دەنگی شێوابوو ، ئاخری منیش ترس دای گرتم . ئەگەر پێویست بوایە قسەم بکردایە ، ورتەم پێ نەئەکرا . ( کوردە ) پاش ئەوە وتی :

— ئێستا ، وا دەس پێ ئەکەین !

سێ پارچە تەختەم لە جانتاکەم دەرهێنا و یەك لەدوای یەك

لەسەر مێزێك دامنان تا دانیشتووەكان هەموویان باش ببینن . ئەوجا ( كوردە ) وتی :

ــ ئێستا لۆپزیك بۆتان ئەژمێرێ ئەم پارچانە چەندن . ئادەی لۆپزیك بژمێرە !

لۆپزیك سێ جار وەڕی .

هەموو بەگەرم دایانە چەپڵە ڕێزان . لە هەموولایەكەوە دەنگی ئافەرین بەرز بووەوە . لۆپزیك ترسا . لە كورسی‌یەكەی بازی دایە خوار . ( كوردە ) گرتی . كولۆیەك شەكری نایە دەمی‌و نایەوە سەر كورسی‌یەكە .

لۆپزیك شەكرەكەی كرماند . برادەرەكان وردە وردە هێمن بوونەوە . پارچە تەختەیەكی‌تریشم دەرهێنا‌و خستمە سەر سێ پارچەكەی ئەوجار . ( كوردە ) ڕووی‌كردە لۆپزیك‌و لێی‌پرسی :

ــ ئەی ئێستا چەندن ؟

لۆپزیك چوار جار وەڕی .

خەڵكەكە دووبارە دایانەوە لە چەپڵە ، لۆپزیك دیسانەوە ویستی ڕابكا ، بەڵام ( كوردە ) لەكاتی خۆیا گرتی‌و شەكرێكی‌تری نایە دەمی .

سێ پارچە تەختەی‌ترم نایە سەر مێزەكە .( كوردە ) پرسی‌یەوە :

ــ ئەی ئێستا چەند پارچەن ؟

لۆپزیك حەوت جار وەڕی .

پارچە مەقەبایەكم لە جانتاكە دەرهێنا لێی‌نووسرابوو (٢) ، نامە بەر پۆزی . ( كوردە ) لێی‌پرسی :

ــ ئەمە چەندە ؟

لۆپزیك دوو جار وەڕی .

هەر بەوجۆرە چەند ژمارەی تریشم پێشـــاندا بێ یانخوێنێتەوە ، هەمووی خوێندنەوە . پاشان (کوردە) لێی پرسی :

— دوو کەرەت دوو ئەکاتە چەنـد ؟ دوو کەرەت سێ ئەکاتە چەند ؟ سێ کەرەت چوار ئەکاتە چەند ؟

هەمووجارێ لۆپزیك بێ هەڵە وەڵامی ئەدایەوەو هاوڕێکان بۆیان ئەدا لە چەپڵە . ترسم لا نەما ، ڕووم کردە دانیشتووەکانو وتم :

- کوڕینە ! لۆپزیك ئەزانێ پرسیاریش لیك بداتەوە . کێتـان ئارەزووی هەیە پرسیاری لێ بکا با بیکا ، لۆپزیك وەڵامی ئەداتەوە ، هەر بەوەەرجە پرسیارەکە ژمارەی گەورەی تیا نەبێ .

یەکێك لە قوتابی یەکان هەڵسایە سەر پێ ، ئەم پرسیارەی کرد :

شووشەیەك و تەپەدۆرەکەی سەری بـــە (١٠) پوول ، نرخی شووشەکە (٨) پوولی زیادە لە نرخی تەپەدۆرەکە ، تەپەدۆرەکە بـــە چەندەو شووشەکە بە چەندە ؟

بە لۆپزیکم وت :

— دەی لۆپزیك ! باش بیر بکەرەوەو وەڵامان بدەرەوە ! دیارە لۆپزیك پێویستی بە بیرکردنەوە نەبوو . بۆیە وامزانی خۆم بتوانم بیر بکەمەوە . گورج وەڵامەکەیم زانی : تەپەدورەکە بـــە (٢) پوولەو شووشەکە بە (٨) پوولەو هەمووی ئەکاتە (١٠) پوول . بە لۆپزیکم وت :

— دەی پێمان بڵێ تەپەدۆرەکە بە چەندە ؟

لۆپزیك دوو جار وەڕی .

— ئەی شووشەکە بە چەندە ؟

هەشت جار وەڕی .

هەموو کردیان بە هەرا :

— وانی یە ! وانی یە ! نەیزانی !

خۆم لێ تووڕه کردن :
— بۆ وا نی‌یه ! شووشه‌و ته‌په‌دۆر هه‌ردوکیان بـه (١٠) پوول ، واته شووشه به (٨)و ته‌په‌دۆر به (٢) .
ئاوه‌له‌کان ده‌سیان کرد به لێکدانه‌وه‌ی بۆم :
— به‌ڕاسته ؟ پرسیاره‌که ئه‌ڵێ نرخی شووشـه‌که (٨) پوولی له هی ته‌په‌دۆره‌که زیـاده . که ته‌په‌دۆره‌که به (٢) پوول بێ ئه‌بێ شووشه‌که به (١٠) پوول بێ ، که‌چی نرخی هه‌ردوکیان (١٠)پوله !
تێگه‌یشتم که به‌هه‌ڵه‌دا چووم ، وتم :
لۆپزیك ! به‌هه‌ڵه‌دا چووی . باش بیر بکه‌ره‌وه‌و وه‌ڵامی ڕاستمان پێ بڵێ .
دیاربوو لۆپزیك نه‌بوو بیری ئه‌کرده‌وه ، خۆم بووم . وتم :
— کوڕینه ! تاوێك لێی ڕاوه‌ستن تا بیر ئه‌کاته‌وه‌و وه‌ڵامه‌که‌ی ئه‌دۆزێته‌وه !
هه‌موو به یه‌ك ده‌نگ وتیان :
— په‌له‌ی لێمه‌که . پرسیاری وا بۆ سه‌گ ئاسان نی‌یه .
که‌وتمه لێکدانه‌وه :
« ئه‌گه‌ر نرخی شووشه‌که ( ٨ ) پوولی له هی ته‌په‌دۆره‌که زیاد بێ ، ته‌په‌دۆره‌که ئه‌کاته ( ٢ ) پوول‌و شـووشه‌که ( ١٠ ) پوول ، ئـه‌وکاته نرخی هه‌ردوکیان ئه‌بێ به ( ١٢ ) پوول ، مه‌سه‌له‌که‌ش ئه‌ڵێ نرخی هه‌ردوکیان ( ١٠ ) پووله . خۆ ئه‌گه‌رنرخی ته‌په‌دۆره‌که ( ٢ ) پوول بێ و نرخی شـووشه‌که ( ٨ ) پوول بێ ، ئه‌بێ نرخی شـووشـه‌که ( ٦ ) پوول زیاتر بێ له هی ته‌په‌دۆره‌که » . هه‌رچه‌ند بیرم کرده‌وه نه‌مزانی.« ئه‌مه چۆن پرســیارێکه ئه‌وه‌نـده ڕه‌قه سه‌ری بنیـاده‌م ئه‌شکێنێ » .
دیسانه‌وه وتم :

— کوڕینە تۆزێکی‌تریش لێی ڕاوەستن ، هەر ئیستا ئەیدۆزێتەوە .
منالەکان وتیان :
— قەیدی نی‌یە ، با بیر بکاتەوە . بەئاسانی نایزانێ ، بنیادەم نی‌یە ، سەگە . .
دەسم کردەوە بە لێکدانەوە . .
( کوردە ) لەژێر لێوەوە پێی‌وتم :
— هەی کەر ! تەپەدۆرەکە بە پوولێکە .
هەمووی حـالی بووم . نرخی تەپەدۆرەکە پوولێکەو نرخی شووشەکە ( ٨ ) پوول لەو زیادە کە ئەکاتە ( ٩ ) پوول ، تێکڕایشی ئەکاتە ( ١٠ ) . هاوارم کرد :
— وریا بن ! دۆزی‌یەوە ! ئیستا وەڵامی ڕاستتان ئەداتەوە .
هەموو بێ‌دەنگ بوون .
— دەی لۆپزیك ! وەڵامان بدەرەوە : تەپەدۆرەکە بە چەندە ؟
لۆپزیك یەکجار وەڕی !
منالەکان تێکڕا هاواریان‌کرد : « بژی ! بژی ! » .
ئەنجا وتم :
— کپ بن ! پرسیارەکە ماویەتی . لۆپزیك ئیستا پێمان‌ئەڵێ : شووشەکەش بە چەندە ؟
نۆ جار وەڕی .
لە هەموو لایەکەوە بوو بە هـەراو چەپڵەڕێزان ، هـەموو ئەیانوت :
— ئەمە ! ئەمە سەگیشە ! لەگەڵ ئەوەشا کە بەهەڵەدا چوو ، ئاخری هەر وەڵامی ڕاستی دۆزی‌یەوە .
ئیتر ئاهەنگەکە دوایی هات .

## بەشی بیستەم

وا سەری ساڵ هاتە پێشەوە .. پشوو دەستی پێ کردو کاو تینە حەسانەوە . خەڵکی هەموو شادمانو کەیفخۆش بوون چونکە لە جەژنا بوون . منو ( کوردە )یش هەروەها هەستمان بە شادمانیی جەژن ئەکرد . بەڵام ئێمە بریارمان دابوو لەجیاتیی ئەوەی جەژنەکەمان تەنها بە کەیفو ڕابواردنەوە بەرینەسەر ، ئیشیش بکەین. هەر لە یەکەم ڕۆژی پشوودا چووین بۆ لای ( ئاواز خان ) ، هەندێ ئیشی پێ سپاردین لە ڕۆژانی پشوودا بییانکەین .

( کوردە ) ئارەزوویەکی زۆری ئیش کردنی پەیدا کردبوو . ئامادە بوو بەدرێژایی ڕۆژ ئیش بکا ، بەڵام من وتم ڕۆژی تەنها دوو سەعات ئیش ئەکەین . ئەوی کەی بە یاریو ڕابواردنو تەماشاکردنی کتێبەوە ئەبەینەسەر . بەمجۆرە هەموو ڕۆژێ سەیری دەرسەکانمان ئەکردەوەو پیا ئەچووینەوە . ( کوردە ) ڕۆژبەڕۆژ پێشتر ئەکەوت . کە پشوو دوایی هاتو چووینەوە قوتابخانە یەکەم ڕۆژ دەرزی نووسینمان هەبوو ، (کوردە) پلەی ( خراپ نییە ) ی تیا وەرگرت . زۆری پێ خۆش بوو وەك بڵێی پلەی ( زۆر چاك ) ی وەرگرتبێ .

لێم پرسی :

— بۆچ ئەوەندە شادمانی ؟ پلەی ( خراپ نییە ) وەنەبێ پلەیەکی ئەوەندە باش بێ .

— بەشبەحاڵی من ( خراپ نییە ) بۆ ئیستام شتێکی زۆر

بەنرخە ! دەمێکە لە دەرزی نووسینا پلەیوام وەرنەگرتووە . بەڵام خۆ وەنەبێ هەرلەم ئاستەدا بوەستم . ئەیبینی بۆ جاری داهاتوو پلەی ( چاك ) وەرئەگرمو پاشانیش ئەگەمە ( زۆر چاك ) .

( یاوەر ) وتی :

— بێگومانم کە ئەیگەیتێ . بەڵام جارێ بێ لە ( زۆر چاك ) مەکەرەوە . هەوڵ بدە ( چاك ) ت دەس کەوێ ، بۆئەوەی مادەم هەموو گاوەڵەکانمان پلەی ( چاك ) و ( زۆر چاك ) وەرئەگرن ، ( خراپ نییە ) لە پۆلەکەمانا نەمێنێ .

( کوردە ) وەڵامی دایەوە :

— گوێ مەدەرێ ، هەموو شتێ بە مرازی دڵ ئەبێ ! لەمڕۆ بەدواوە سەرتان شۆڕ ناکەم . ئیستا ئەزانم ئەبێ هەموومان بۆ شەرەفی پۆلەکەمان تێبکۆشین . منیش وا کە پێویست بێ دەسم کردووە بەمەو بنچینەیەکم دارشتووە .

( ئاواز خان ) یش زۆر لە ( کوردە ) شادمان بوو . پێیوتین :

— ڕۆڵەکانم ! ئیستا وەختی ئەوە هاتووە ئیشێکیش بۆ سوودی گشتی بگرنە ئەستۆ . هەموو قوتابییەکان ئیشی گشتییان وەرگرتووە ، هەر ئێوە ماون هیچتان نەگرتووەتە خۆتان .

وەڵامم دایەوە :

— ئێمەش شتێك ئەگرینە خۆ .

( کوردە ) وتی :

— دەمێکە ئەمەوێ لە ڕۆژنامەی دیوارا ئیش بکەم ، بەڵام بەختم نەبوە هەڵمبژێرن بۆ ئەندامەتیی دەستەی نووسەران .

منیش وتم :

— ڕاست ئەکا . با هەڵمان بژێرن بۆ ئەندامەتیی دەستەی

نووسەران .

( ئاواز خان ) وەلامی دایەوە :

— هێشتا زۆرتان ماوە بۆ ئەوەی لە دەستەی نووسەرانا هەڵتان بژێرن . ئەو قوتابییانە هەڵئەبژێررێن بۆ دەستەی نووسەران کە پایەیان لای ئاوەڵەکانیان لەوانی تر بەرزتر بێ .

(کوردە) وتی :

— چون یەکە . هەر ئیشێك بێ وەری ئەگرین . ئەگەر تۆ بتەوێ لە لیژنەی تەندروستی دا دائەنرێین . لە پۆلی دووهەما لەم لیژنەیەدا ئیشم کردووە زۆرم حەز ئەکرد قوتابییەکان بخەمە سەر سەوداى دەس وپەل شتن و گوێچکەیان پێ پاك کەمەوە .

— دەمێکە لیژنەی تەندروستیمان داناوە ، بەلام ئەگەر ئەتانەوێ ئیشێکی زۆر گرنگ هەیە ئەوەتان پێ ئەسپێرم . ئەبێ کتێبخانەیەك بۆ پۆلەکەمان رێکخەین . ئێوەش ئەبن بە سەرپەرشتی کەری ئەو کتێبخانەیە .

— ئەی کتێبی لەکوێ بۆ دێنین ؟

— لە کتێبخانەی قوتابخانە . دۆلابێکیشتان بۆ دێنم .

(کوردە) وتی :

— من زۆر حەزم لە خوێندنەوەیە . ئەم ئیشە وەرئەگرم .

منیش وتم :

— منیش .

( ئاواز خان ) وەلامی دایەوە :

— زۆر چاکە . هەول بدەن سەرپەرشتی کەری چاك بن . ئاگاتان لە کتێبەکان بێ و وریا بن ئاوەڵەکانیشتان ئاگاداری یان بکەن .

( دادە تابان )ی ئەمینداری کتێبخانەی قوتابخانەمان دۆزییەوەو

پێمانوت کارا کراوین بە سەرپەرشتی کەری کتێبخانەی پۆلی چوارز پێویستمان بە کتێبە .

( دادە تابان ) وتی :

— کتێب بۆ پۆلی چوار؟ باشە . لای منە . تاوێکی تر ئەتاندەمێ .



کۆمەڵێك کتێبی داینێ . هەڵمانگرت بردمان بۆ پۆلەکەمان . کتێبەکان زۆر بوون . صەد دانەیەك ئەبوون . بەڵام کە خستمانە دۆلابێ کە زۆر نەبوون ، تەنها سێ ریزیان پڕ کرد . ئەو سێ ریزەکەی بە بۆشی مایەوە .

( کوردە ) پێشنیاری کرد :

— ئەڵێی چی ئەگەر هەندێکیش کتێب لە ماڵی خۆمانەوە بێنین تا زۆر بن ؟ من خۆم ئەتوانم پێنج شەش کتێب بێنم .

وەڵامم دایەوە :

— منیش ئەتوانم پێنج کتێبێك بێنم . بەڵام ئەمە بۆ پڕ کردنەوەی سێ ریزە بۆشەکەی دۆلابەکە بەش ناکا .

— ئەی ئەڵێی چی داوا لە ئاوەڵەکانمان بکەین؟ بەڵکو هەرکامیان تیابێ کتێبی هەبێ خوێندبێتیەوەو پێویستی پێ نەمابێ بۆمان بێنێ .

لەم بابەتەوە لەگەڵ ( ئاواز خان ) قسەمان کرد . پێی وتین :

— باشە ، قسە لەگەڵ ئاوەڵەکانتان بکەنو مەسەلەکەیان تێبگەیەنن . لەوانەیە بەگوێتان بکەن .

سبەینێ بۆمان باس کردن کە وا کتێبخانەیەك بۆ پۆلەکەمان دانراوە ، بەڵام کتێبی زۆری تیا نییە . کێ کتێبی زیادی هەیە با بۆمان بێنێ هەرچەند تاقە کتێبێکیش بێ .

هەموو ئاوەڵەکان بەگوێیان کردین . هەریەکێ کتێبێكو دوانو زیاتریان هێنا . دۆڵابەکەمان پڕ بوو . ویستمان گورج دەس کەین بە کتێب دابەش کردن بۆ خوێندنەوە . بەڵام ( ئاواز خان ) وتی ئەبێ لەپێشا لیستەیەك بۆ کتێبەکان بکەین . دەفتەرێکی گەورەمان هێنا ، ناوی هەموو کتێبەکانمان تیا نووسیو ژمارەمان بۆ دانان ، تا هەر کتێبێکمان بوێ ، بۆی نەگەڕێین بە دۆڵابەکەدا ، سەیری لیستەکە بکەینو بزانین لەکوێدایە گورج دەری بێنین . کوردە زۆر بەوە دڵشاد بوو کە ڕێكوپێکی هەموو سەرێکی کتێبخانەکەمانی گرتەوە . لە هەمووی زیاتر بەوە دڵخۆش بوو کە هەموو خانەکانی دۆڵابەکە پڕ بوون لە کتێب . ( کوردە ) ئەیوت :

— ئێستا ، ڕاستە هەمووشت بە ئارەزووی خۆمانە ! کەمو زیادی نییە .

( کوردە ) بەشێکی زۆری وەختی خۆی بە کردنەوەی دەرگای دۆڵابەکەو تەماشاکردنی دیمەنی کتێبەکانەوە ئەبردەسەر .

هەندێ لە کتێبەکان تا ڕادەیەك کۆنبوون . هی وایان تیابوو بەرگەکەی لێبووبووەوە . هەندێکیشیان جزووبەندەکەیان تێکچووبوو . بڕیارماندا ئەوانەیان بەرینەوە بۆ ماڵ چاکیان کەینەوە . لە ماڵەوە کەتیرەمان هەبوو . کە لە ئیشەکانمان بووینەوە چووین بۆ ماڵی خۆمان

دەسمان کرد بە چاك کردنەوەی کتێبەکان . کە (لاولاو) زانی چی ئەکەین ویستی یارمەتیمان بدا .

بەرگی کتێبەکان لە هەمووی زیاتر ماندووی کردین . (کوردە) بەدرێژایی وەخت هەر بۆڵەی ئەهات :

— ئەمە بـــوو بە چی ؟ نازانم ئەم منالانە چی ئەکەن بەم کتێبانە ؟ بە سەری یەکتریانا ئەدەن ؟

(لاولاو) وتی :

— تۆ ئەڵێی چی ! کەس شەڕ بە کتێب ناکاو کتێب نادا بـە سەری کەسا . قسەی قۆڕە . کتێب بۆئەوە دروست نەکراوە .

— باشە ، ئەی بۆ وا بەرگەکانیان لێبووەتەوە ؟ ئەگەر بە ئارام تیایانا بخوێننەوە بەرگیان لێ ئەبێتەوە ؟

— دیارە نەء .

— منیش ئەڵێم نەء . سەیری ئەم پەڕەیە بکە چۆن جیا بووەتەوە ! بۆچی وای لێ هاتووە ؟ بشـــێ شەیتانێکی وایان تیابێ لە جیاتی ی خوێندنەوە خۆی بە دڕینی پەڕەکانەوە خەریك بـــکا ؟ ئەبێ بـۆچی بیدڕێنێ ؟ منالی وا ئەبێ بە تۆژ بەکێش بکرێ تا لەمەولا وا نەکا لە کتێب . پەڕەیەکی وا لە هـەر کتێبێ لەناوبچێ ، هەرکەس تەماشای ئەو کتێبە بکا هیچی لێ حالی نابێ .

— ئەی توخوا ئەمە کاری کەردەنی یە ؟

وەلامان دایەوە :

— ڕاستئەکەی ، نەوەڵڵا کاری کەردەنی نی یە !

— ئەی ئەمە : سەگی شەش پێ ! شتی وا کەی ڕاستە ؟

(لاولاو) وتی :

— ڕاست نی یە . سەگ ئەبێ چوار پەلی بێ .

— هەی هەی ! کچێ نا ، من باسم لەوە نی یە .
- ئەی باست لە چی یە ؟
— ئەڵێم ڕاستە وێنەی سەگێ لە کتێب بکێشرێ ؟
(لاولاو) دایە پاڵی و وتی :
— نەوەڵڵا هیچ ڕاست نی یە !
(کوردە)یش بەدوایا وتیەوە :
— نەوەڵڵا هیچ ڕاست نی یە . چوار پەلی بێ و شەش پەلی بێ وەك یەکە . بە هیچ جۆرێ نابێ وێنەی لەسەر کتێب بکێشرێ . ئیتر سەگی شەش پەل بێ یا نەبێ . نابێ کەس وێنە لەناو کتێبا بکێشێ نە هی سەگ و نە پشیلەو نە هی ئەسپ . ئەگەر یەکێك وێنەی سەگێکی کێشا کەسێکی تریش دێ وێنەی پشیلەیەك ئەکێشێ ، یەکێکی کەش چاو لەوان ئەکاو شتێکی تر دائەهێنێ ، تا وای لێ دێ کەس دێڕێکی لە کتێبەکە پێ ناخوێنرێتەوە .
— ئەی ئەمە چی یە ؟ کێ یە ئەم وێنەی ڕۆزەی کێشاوە ، نەك بە قەڵەم فەرەنگی یش ، بە مەرەکەب !
ویستی وێنەکە بکوژێنێتەوە ، بەڵام قاقەزەکە مەرەکەبەکەی هەڵمژیبوو ، قاقەزەکەی کون کرد . ڕقی هەڵسا :
— ئاخ ! ئیستا ئەو ناپەسەندەم بەردەس کەوتایە کە ئەم وێنەیەی کێشاوە . چیم پێ ئەکرد ! کتێبەکەم لە دەسی ئەسەندو ئەمکوتا بە تەپڵی سەریا .
(لاولاو) بەرپەرچی دایەوە :
— تۆ ئیستا خۆت وتت شەڕ بە کتێب ناکرێ چونکە بەرگەکەی لێ ئەبێتەوە !
(کوردە) لە کتێبەکە ورد بووەوە و وەڵامی دایەوە :

— ئەمەیان بەرگەکەی ئەستوورە هیچی لێ نایەت !
منیش وتم :
— نەخەیر ، ئەگەر هەموو سەرپەرشتیکەرەکانی نامەخانەکان بە کتێب لە خوێنەرەوەکانیان بدایە ، کتێب نەئەما بەرگی پێوە بمێنێ!
(کوردە) وتی :
— لەگەڵ ئەوەشا ئەبێ فێریان کەین . نازانم لەگەڵ خوێنەرەوەی وەك ئەمانەدا بنیادەم ئەبێ چی بکا . من بە فەوتاندنی ماڵی گشتی ڕازی نیم .
وتم :
— ئەبێ بە ئاوەڵەکانمان بڵێین ئاگایان لە خۆیان بێ .
(لاولاو) پێشنیاری کرد :
— ئەی بۆچی دروشمێك بۆ خۆمان دروست نەکەین ؟
ئەم پێشنیارە بە دڵی (کوردە) بوو ، وتی :
— بیرێکی جوانە ! بەڵام چی لێ بنووسین ؟
(لاولاو) وتی :
— ئەتوانین لێی بنووســین : « ئاگات لە کتێبەکە بێ ، ئاسن نی یە ، قاقەزە » .
لێم پرسی :
— پێشان هەرگیز دروشمی وات دیوە ؟
— نەوەڵڵا هەر بە خەیاڵما هات .
— بەهێز نی یە ! کەس پێویستی بەم دروشمەی تۆ نی یە تا بزانێ کتێب لە ئاسن دروست نەکراوە .
(کوردە) وتی :
— ئەتوانین سووك و ئاسان بنووسین : « پارێزگاری ی کتێبەکەت

بکە ، وەك چۆن پارێزگاریی چـــاوت ئەکەیت » ئەمە کورت و پوختەو مەبەستێش ئەگەیەنێ .

وەڵامم دایەوە :

— نەوەڵڵا ، پێم جوان نییە . چاو پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە چییە ؟ ئەنجا بۆ نالێی : پێویستە ئاگات لە کتێب بێ خراپ نەبێ .

(کوردە) وتی :

— باشە ئەنووسین : « ئاگات لە کتێبەکان بێ نەدڕێن ، نرخیان گرانە » .

وەڵامم دایەوە :

— ئەمەشم لا پەسەند نییە ، چونکە وانەگەیەنێ قەیدی نییە کتێبی هەرزان بدڕن .

(لاولاو) پێشنیاری کرد :

— بڕوانە ! ئەنووسـین : « ئاگات لە کتێب بێ ، کتێب برادەرتە » .



لێـــکم دایەوە کتێب دۆستی بنیادەمە چونکە چاکەی فێر ئەکا . ئەبێ وەك دۆست ئـــاگاداریی بکەین . جوانە ، ئەمە عەقڵ ئەیگرێ .

بـــیرم کردەوەو ڕەزامەندیم پیشاندا .

کارتۆنێك و هەندێ بۆیەمان هێناو دروشمەکەمان نووسی . بۆ

سبەینێ لای دۆلابەکەدا کوتامان بەدیوارا . دەسمان کرد بـە دابەش کردنی کتێب . هەر جارێ کە ( کوردە ) کتێبێکی ئەدا بـە ئاوەڵێك ، پێی ئەوت :

— ئاگادار بە ! نە سەگ و نە بنیادەم و نە هیچ !

— بۆچی وام پێ ئەڵێی ؟

— بۆیەت پێ ئەڵێم بە خەیاڵتا نەیەت وێنـەی هیچ لە کتێبەکە بکێشی .

— نایکێشم !

— نەء . بزانە ئیشی من ئەوەتە ئاگادارت کەم : نە سەگ و نە بنیادەم ! ئەم کتێبە هی هەموانە . ئەگەر هـــەر هی خۆت بوایـە ئەتتوانی ئارەزووت لە وێنەی هەرچی بێ لێی بکێشی ، هەرچەنـد نابێ وێنەی هیچ لە کتێبی خۆیشـــت بکێشی ، چونکە پاش خۆت خوشکە بچکۆلەکەت یا برا بچووکەکەت بەدەستیەوە ئەگرێ ، یـا ئەیدەی بە برادەرێکـــت بیخوێنێتەوە . ئیشی من ئەوەتـــە وریات کەمەوە ، جـا ئەگەر نەتەوێ تێ بگەی بە زمانێکی تر قسەت لەگەڵ ئەکەم .

— باشە ! تێ گەیشتم .

بەڵام ( کوردە ) دەسـتی هەڵ نەئەگرت . هەر کە ئاوەڵێك ئەهاتە لای داوای کتێبێکی ئەکرد بۆی ئەوتەوە کە چەند پێویستە ئاگاداری کتێبەکە بکا .

دەرز دوایی هات . ( کوردە ) چوو لای دۆلابەکەدا دانیشـت . کە ســـەیری خانەکانی دۆلابەکەی کرد لـــە هەموو لایەکەوە کەلەبەریان تێ کەوتبوو ، خەمو پەژارە دای گرت :

— کتێبەکان کەم بوونەتەوە ! دۆلاَبەکە چەند جوانە بە پڕی . ئەبێ دیسانەوە داوای کتێبی تری بۆ بکەین لە ئاوەڵەکان .

ویستم نەختێ دڵی بدەمەوەو خەفەتی لە دڵ لادەم ، پێموت :

— جا چی تیایە ؟ ئاوەڵەکان کە لە خوێنـــدنەوەی کتێبەکان بوونەوە ئەیانهێننەوە .

— دیارە ئەیانهێننەوە . بەڵام بەچی ئەچێ ؟ کتێبێك دێننـەوەو یەکێکی تر ئەبەن . دۆلاَبەکە هەر بە خاڵی یەتی ئەمێنێتەوە .

— تۆ بۆ ئەتەوێ کتێبەکان هەمیشە لە دۆلاَبەکەدا بن ؟ کتێب بۆ ئەوە دانراوە بخوێنرێتەوە ، نەك بۆ ئەوە لەسەر ڕەفە دانرێ .

( کوردە ) وتی :

— ئـەوە چی یە ؟ ئەڵێی تۆیش کتێب ئەبەی ؟ کتێبەکان کەم بوونەتەوە .

پێموت :

— زوو ئەیخوێنمەوەو ئەیهێنمەوە .

کە ئەمەی دی خۆیشی کتێبێکی دەرهێنا ، ویستی دڵخۆشی ی خۆی بداتەوە ، وتی :

— قەیدی نی یە ، پاش ئەو هەموو کتێبە کە ڕۆیی ، با منیش ئەم کتێبە وەربگرم . هیچی پێ کەم نابێتەوە !

لەوڕۆژە بەدواوە منو ( کوردە ) زۆرمان ئەخوێندەوە . کتێبێکی زۆرمان لە بەردەستا بوو . ( کوردە ) هەتاوەکو بە ڕێگاشا هـــەر ئەیخوێندەوە . کتێبێکی لە کتێبخانەکە دەرئەهێناو کە ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ بەڕێوە تەماشای ئەکرد ، هەتا جارێکیان لەسەر جادە خۆی دا لە دار عەلەترێکێك سەری برینـدار بوو . پاش ئەوە دەستی لە

خوێندنەوەی سەرچادە هەڵگرت . لە ماڵا نەبوایە نەی ئەخوێندەوە .

ئیشی سەرپەرشتیی کتێبخانە کردی بە کوڕێکی وریا . وردە وردە ڕەوشتیشی گۆڕا . قوتابی‌یەکی ڕێك وپێـکی لێدەرچوو فێری ڕێکخستنی ئیشی خۆی بوو . وەك جاران وەختی بە ڕابواردنەوە نەئەبردەسەر . زۆر وردەکاری‌ی لەگەڵ ئاوەڵەکانی ئەکرد ، یەکێکیان بهاتایە داوای کتێبێکی بکردایەو دەسی چڵکن بوایە ڕسوای ئەکرد :

— داناوەشێی ؟ ئەوە چیت کردووە وا ئەوەندە دەسـەکانت پیسن ؟

— بە تۆ چی ؟ خۆم پیسم کردوون .

— بە من چی ؟ چون بە من چی ؟ نەهاتووی کتێبت بدەمێ ؟

— بـا !

— جا ئەتەوێ بەم دەسە پیسانەتەوە کتێب وەرگری ؟

— ئەی بە چی ئەتەوێ وەری‌گرم ؟

— کتێب بە دەسی پاك وەرئـەگیرێ . بەم دەسانـەت پیسی ئەکەی .

— کە چوومەوە ماڵەوە ئەیانشۆم .

— شتی‌وا نی‌یە ! لەپێشا بڕۆ بەر بەلووعەکە دەست بشۆ ، ئەوجا وەرە کتێب وەرگرە .

— کە منداڵێکیش ماوەیەکی زۆر کتێبێکی لا بمایەتـەوە ، بەزمێکی‌تری لەگەڵ ئەکرت :

— شوورەیی ناکـەی ئەم ماوە زۆرە ئەو کتێبەت لای خۆت گلداوەتەوە ، برادەرەکانیشت ئەیانەوێ بیخوێننەوە ، کەچی تۆ لای خۆت ڕاتگرتووە ؟ ئەگەر ناتەوێ ئیستا بیخوێنیتەوە ، بیهێنەرەوەو پاشان وەری‌بگرە .

— هێشتا لێ نەبوومەتەوە . کە لێبوومەوە ئەیهێنمەوە .

— ڕەنگە بێ بە صەد سال لێ ببیتەوە ؟

— بۆ بە صەد سال ؟ ناتوانم دە ڕۆژ لای خۆم بیهێڵمەوە ؟

— بەڵێ ئەتوانی دە ڕۆژ بیهێڵیتەوە ، بەڵام تۆ لەکەیـــەوە بردووتە ؟

— هەفتەیەکە . هێشتا دە ڕۆژی پڕ نەکردووەتەوە .

— جا بۆ ئەبێ چـاوەڕوان بی تا دە ڕۆژەکە دوایی دێ ؟ دە ڕۆژ دوا مۆڵەتە . ئەگەر پێشان تەواوت کرد ئەبێ بیهێنیتەوە . کـەس زۆرت لێناکا دە ڕۆژ لای خۆت ڕاگیری کەی .

— بەڵام من پێم‌وتی هێشتا تەواوم نەکردووە .

— کەواتە دەس‌وبرد کە لێ ببەرەوە .

لـەگەل ئەوەشـا پێی خۆش نەبوو یەکێ زوو لـە خوێندنەوەی کتێبێك ببێتەوە :

— بەڵام پێم ناڵێی چون وا زوو پێت خوێنرایەوە ؟ تـۆ دوێنێ وەرت‌گرت ، کەچی وائیستا هێناتەوە . بەڕاست خوێندووتەتەوە ؟

— ئەی بۆچیم وەرگرتووە ؟

— چوزانم ! ڕەنگە‌بێ لــەوە زیاترت نەکردبێ وەك منال پەڕە پەڕەت کردبێ .

— بۆچی من منالۆچکەم ؟

— لەوانەیە . ئـەگەر ڕاست ئـەگەی خوێندووتەتەوە ، بـــۆم بگێڕەرەوە باسی چی ئەکا :

— بۆچی تاقیم ئەکەیتەوە ؟

— ئەبێ بزانم خوێندووتەتەوە یـا نـە ؟

—تۆ چی بەدەستی ؟ ئیشی تۆ ئەوەیە کتێب دابەش کەی . ئەوە نی‌یە بزانی ئەوکەسە ئەیخوێنێتەوە یـا نە !

— هیـچ وا نی‌یە ! مادەم من کراوم بە سەرپەرشتی کەری کتێبخانە ئەبێ بزانم ئەوانەی کتێب وەرئەگرن ئەیخوێننەوە یا نە ؟ ئەگەر بزانم نایخوێننەوە پێویست ناکا جارێکی تـر کتێبیان بدەمێ ، بەوانەی بدەم باشترە کە ئەخوێننەوە .

قوتابی‌یەکە ناچار ئەبوو بۆی باس بکا کتێبەکە لە چی ئەدوێ .



(کوردە) لەو ڕۆژەوە کە لە دەرزی ڕووسی یەکەیدا پێش کەوت و نیشێکی گشتی گرتە ئەستۆ، پایەو جێگایەکی تری لە ناو ئاوەڵەکانیا وەرگرت و قسەی بڕشتی پەیدا کرد. ڕێگای درا لەگەڵ تیپی باسکت بۆڵا یاری بکا. سەیر ئەکەین یاری کەرێکی چاکی لێ دەرچووە. هەڵیان بژارد بۆ سەرۆکایەتی تیپەکە. مەشقێکی باشی پێ کردین تا وامان لێ هات قارەمانەتی پۆلەکانمان دەس خست. بەمە پایەمان بەرزتر بووەوە و لە ڕۆژنامە دیواری یەکەی قوتابخانەدا لەسەر تیپەکەمانیان نووسی.

تەنها یەك ناتەواویمان هەبوو تا هەموو شت بە ئارەزووی دل بڕوا: من لە پیاچوونەوەو پێ ڕەوان کردنی دەرزی ڕووسیدا لەگەل (کوردە) بەگەرم هەر بەردەوام بووم. بەڵام ئەو هەر نەی ئەتوانی پلەی (خراپ نی یە)کەی بلەقێنێ. وای ئەزانی مادەم پلەی (خراپ نی یە)ی وەرگرتووە، دوابەدوای ئەوە گورج پلەی (چاك)و (زۆر چاکك)یش وەرئەگرێ. بەڵام وا نەبوو. (ئاواز خان) هەر

پلەی (خراپ نی یە)ی بۆ دائەنا. ئاخری ناهومێدی دایگرت.
بە (کامەران)ی وت :

— بزانە ، ها ! ئیتر پلەی (خراپ نی یە)م ناوێ ! من سەرپەرشتی کەری کتێبخانەو سەرۆکی تیپی باسکتبۆلم ، لە ڕۆژنامەی دیواریشا لەبارەمەوە نووسراوە. ناکرێ من ئەمە بەو کەچی هەر پلەی (خراپ نی یە) وەربگرم !. (کامەران) وتی :

— تۆزێ خۆت بگرە ! ئەبێ لە هەوڵو تەقەلاتا بەردەوام بی.

— ناشێ وابزانی بۆیە وائەڵێم نامەوێ لەمەولا ئیش بکەم ؟ ئەمەوێ ئیش بکەم ، بەڵام (ئاواز خان) هەرگیز پلەی لە (خراپ نی یە) چاکترم بۆ دانانێ. خووی بەوەوە گرتووە هەمیشە بە قوتابی یەکی تەمەڵو بێکارە بێمە پێش چاوی. ئەبێ تا ڕۆژی قیامەت هەر بە سێ پێ بڕۆم بەڕێدا.

— وانی یە ! (ئاواز خان) مامۆستایەکی دادپەروەرە ، ئەگەر شایانی پلەی (چاك) بی بۆت دائەنێ.

— ئاخ! خۆزگە زوو بۆی دائەنام! من تاقە کەسێکم لەم پۆلەدا هێشتا هەر پلەی (خراپ نی یە) وەربگرێ. ئەگەر من نەبووما یە لە پلەی (چاك)و (زۆر چاك) بەولاوە لە پۆلەکەمانا نەئەبوو. من بووم بەهۆی لە کەڵك کەوتنی هەموو شتێك.

بەهێزێکی تازەوە لەسەر ئیشی خۆمان ڕۆیشتین. (ئاواز خان)یش لەپاش دەرس لەگەڵی خەریك ئەبوو. ئەمە وای لێکرد وردە وردە بەڵام بە هەنگاوی پتەو ئەندازەیەکی تر پێش بکەوێ. شەش هەفتە پاش دواجاری وەرگرتنی پلەی (خراپ نی یە) ، بۆ یەکەمجار پلەی (چاك)ی وەرگرت. ئەمە ڕووداوێکی خۆش بوو دڵی هەموو قوتابی یانی پۆلەکەی شاد کرد.

ئەوڕۆژە کۆبوونەوەیەك کرا . لەو کۆبوونەوەیەدا ( ئاواز خان ) باسی پلە وەرگرتنی کرد ، وتی :

— ئیستا کەسمان نەماوە پلەی (خراپ)ی ببێ . توانیمان کارێك بکەین پلەی (خراپ)و بەڵکـــو ( خراپ نی یە ) یش لە پۆلەکەمانا نەهێڵین .

. هەروەها باسی ئەوەشی کرد کە منو (کوردە) بەباشی هەوڵمان داوەو ( کوردە ) چاری دواکەوتوویی یەکەی خـۆی کردووەو ئیستا ئەتوانێ خۆی بە قوتابی یەکی تێکۆشەر بداتە قەڵەم . وتیشی :

— قوتابخانەکەمان گەلێ پۆلی هەوڵدەری هەیە . ئەو پۆلانەش گـــەلێ قوتابیی چاكو هەڵبژاردەیان تێ ایە ، بەڵام هیچ پۆلێك وەك پۆلەکەی ئێمە لـەناو خۆیا جۆر نی یە . قوتابی یانی پۆلەکەی ئێمەکەسیان تیـا نی یە لە پلەی ( چاك )و ( زۆر چاك ) کەمتر وەربگرێ . لاموایە ئێوە ئەبن بە سەرمەشقی هـەموو پۆلەکانـو ئەوانیش لەسایەی ئێوەوە لەمەوپاش پلەی وەك ئێوە وەرئەگرن . بەڵام ، کوڕەکانم ، وریا بن ، بەم سەرکەوتنەتان خۆتان لێ بایی نەبێ پشتێنی لێبکەنەوە ! نەشەی سەرکەوتن سـەرخۆشتان نەکا ، ئاکاتان لە خۆتان نەمێنێ ! ئەگەر تۆسـقاڵێك سستیو کەمتەرخـەمی بنوێنن پلەکانتان دائەخزێتە خوارەوە ، ها !

پاش ئەو ( کامەران ) قسەی کرد ، وتی :

— کوڕینە ! ئەمەوێ وتارێك لە بابەت پۆلەکەتانەوە بۆ ڕۆژنامەی دیوار بنووسم . ئەبێ هەموو قوتابی یەکانی ئەم قوتابخانەیە بزانن ئێوە چۆن هەوڵ ئەدەن تا هەموو پۆلەکان چاوتان لی بکەن . ئادەی بۆم باس کەن چیتان کرد وا ئەم ئەنجامە باشەتان لە خوێندنی ئەمساڵتانا دەسگیر بوو .

( ئازاد ) وتی :

— لاموایە ئەمە ئەگەڕێتەوە سەرئەوە کە ( ئاواز خان ) مامۆستایەکی چاکە .

( جوامێر ) دوابەدوای ئەو وتی :

— ڕاستە ! ( ئاواز خان ) مامۆستایەکی زۆر چاکە .

( ئاواز خان ) خۆی هەڵسایە سەر پێ ، وتی :

— وەنەبێ هەمووشتێ لە پۆلدا بەسرابێ بە مامۆستاوە ، وا ئەبێ تاقمێك مامۆستا هەندێ پۆلی‌وایان بەدەستەوە ئەبێ هەموو قوتابی‌یەکانی ئەو پۆلانە هەوڵدەرو تێکۆشەر نابن .

( ئاشتی ) لەویا وتی :

— ئێمە کە ئەم ئەنجامە باشەمان دەسگیر بووە هەم هی ئەوەشە ( ئاواز خان ) مامۆستای چاکەو ، هەم هی ئەوەشە هیچ کام لە ئاوەڵەکانمان لەوانە نەبوە نەیەوێ بخوێنێ .

( کامەران ) وتی :

— باشـە ! کەواتە بۆم باس‌کەن هی چی‌یە وا هەمووتان ویستووتانە بخوێنن ؟

( کوردە ) هەڵسایە سەرپێ ، وتی :

— ئەتوانم وەڵام بدەمەوە ؟ من لاموایە هی ئەوەتە هـەموو قوتابی‌یەکانی پۆلەکەمان بەڕاستی هاوڕێی یەکترین . کەسیان تیا نی‌یە تەنها بیری لە خۆی کردبێتەوە . وەك بیریان لە خۆیان ئەکردەوە بیریان لە هاوڕێکانیشیان ئەکردەوە . من ئەمەم بە چاوی خۆم دیوە . ئەودەمە کە من لە دەرسەکانما کەمتەرخەم بووم هەموو قوتابی‌یەکان مەبەستیان بوو چارێکی ئەو وەزعە بکەن ، بەڵام من خـۆم چـوار پێ بووم گوێم نەئەدایەو بەڵـکو پێیشم ناخۆش بوو ئەوان قسەیان

لە ئیشی منا بکردایە . کەچی ئیستا تێئەگەم هاوڕێکانم ئەیانویست یارمەتیی من بدەن و بۆ شەرەفی پۆلەکە تێئەکۆشان .
( ئاوازخان ) وتی :
— قسەکەی ( کوردە ) تەواوە . دۆستایەتیتان بووە بە هۆی سەرکەوتنتان . قوتابییەکان لەوە گەیشتبوون کە دۆستایەتیی ڕاستە قینە ئەوە نییە چاو لە کەم و کورتیی ئاوەڵەکانتان بپۆشن ، ئەودتە هانیان بدەن چاری ئەو کەم و کورتییانەیان بکەن .
ئەنجا من داوای قسەم کرد . هەڵسامە سەرپێ وتم :
— ئیستا وا تێگەیشتم بنیادەم ئەبێ لەگەڵ دۆست و برادەری خۆی چۆن بێ . ئەبێ بییانهێنێتە سەر ئەوە کە هەوڵ بدەن . ئەگەر هەڵەیان کرد ئاگاداریان بکا لە هەڵەکەیان ، ئەگینا بە هاوڕێیەکی خراپ دائەنرێ . من ئەمەم بە چاوی خۆم دی ، کوردە لەپێشا باش ئیشی نەئەکرد . منیش یارمەتیمدا لەسەر ئەو وەزعەی خۆی بڕوا . دیارە من کارێکم کرد وەزعی خراپتر بێ . پاشان کە تێگەیشتم ، نەمهێشت لەسەر ڕەوشتی جارانی بەردەوام بێ . کەواتە ئیستا بەڕاستی دۆستیمی .
( کامەران ) قسەکەمی پەسەند کرد ، وتی :
— زۆر ڕاستە !
بەم جۆرە گەلێك دواین و گەلێك پرسیارمان کرد . پاشان ( کوردە ) بە ( ئاواز خان ) ی وت :
— ئەمەوێ داوات لێ بکەم ئیستا لە لیستەکەم بنووسی کە پلەی ( چاك )م وەرگرتووە .
( ئاواز خان ) وەڵامی دایەوە :
— لە دوایی هەفتەدا پلەی هەموو قوتابییەکان ئەخەمە سەر

لیستەکانو بۆ تۆیش ئەنووسم .

— تکا ئەکەم ئەمڕۆ بۆم بنووسی ، زۆر حەز ئەکەم !

— پەلەت چییە ؟ خۆ لە دەست دەرناچێ !

— ئەزانم لە دەستم دەرناچێ ، بەلاّم ئەمەوێ پیشانی دایکمی بدەم ، دەمێکە گلەیم داوەتێ ئەبێ پلەی ( چاك ) لە دەرسی رووسیدا وەرگرم .

( ئاواز خان ) لێی پرسی :

— بۆچی تا لیستەکەت پێ نەبێ دایکت باوەڕت پێ ناکا ؟

( کوردە ) وەلاّمی دایەوە :

— باوەڕم پێ ئەکا ، بەلاّم خۆت ئەزانی قسە شتێکەو لیستەکە شتێکیترە . منالەکان هەموو دایانە پالّی ، بە ( ئاوازخان ) یان وت :

— ڕاست ئەکا ( ئاواز خان ) ، بۆی بنووسە ، زۆر حەزی لێیەتی . ( کامەران ) یش وتی :

— ( ئاواز خان ) ! هەموومان داوات لێئەکەین بۆی بنووسی . تەنها بۆ ئەمی بنووسە . ئەوانیتر ئەتوانن تا دوایی هەفتە چاوەڕوانی بکەن .

( ئاواز خان ) زەردەخەنەیەکی کردو وتی :

— مادەم هەمووتان داوا ئەکەن .. ئەمەی وت و لیستەکەی لە دەسی ( کوردە ) وەرگرت .

کە ( ئاواز خان ) خەریکی نووسینی پلەی ( چاك )ەکە بوو لە لیستەکەی ( کوردە ) ، ئەم بە پەشێوییەوە سەیری ئەوی ئەکرد .

لەگەلّ ( کوردە ) پێکەوە لە قوتابخانە هاتینە دەرەوە .

سەرنجمدا لەوکاتەدا کە ئێمە لەژوورەوە خەریکی گفتوگۆ بووین سەرما شکابوو ، دنیا گەرمتر بووبوو . بەیانی کە هاتینە قوتابخانە هەوا سارد بوو ، بەڵام وا ئێستا سەهۆڵی دارۆچکاوی پاساری ماڵەکان کەوتووتە توانەوە . کە تیشکی ڕۆژ لێی ئەدا ئەدرەوشێتەوە ، لەو قاقەزە ڕەنگاو ڕەنگە ئەچێ بە درەختی سەری ساڵیا هەڵ ئەواسن . با ئەیدا بە ڕوومانا ، بەڵام بایەکی ناسک بوو ئەتوت شەماڵە بە خۆشیو بە پەلە لە باشووری وڵاتەوە دێت . لە دەشتی قازاخستانەوە کە لەوێ بەهار هاتووەو دەس کراوە بە داچاندنی تۆوی گەنمەبەهارە .. چەند هەستم بە شادمانی ئەکردو چەند دڵم خۆش بوو ! دڵم توند لێی ئەدا ، ئەتوت ئەیەوێ باز بداو لە سنگم دەرپەڕێتەدەر . حەزم ئەکرد دنیا بدەمەبەر ، بەڵکو ئەمویست بدەمە شەقەی باڵ ! مێشکم پڕ بوو لە خەیاڵاتی جوانیوا کە لەوەوپێش هەر بەبیریشما نەهاتبوون . ئارەزووم لەوە بوو ببم بە مرۆڤێکی مەردی نیازپاکو ئیشێکی لە عادەت بەدەریوا بکەم گیتی هەمووی سەری لێ سڕ بمێنێ . ئەمویست هەمووکەس وەك من دڵی شاد بێ .

بیرم لەم شتانە ئەکردەوەو ( کوردە )یش ئەچوو بە ڕێداو سەرنجی هیچی نەئەدا . کوتووپڕ وەستاو لیستەی پلەکانی لە جانتاکەی دەرهێنا . بە زەردە خەنەیەکەوە سەیری پلە (چاك)ەکەی کردو وتی :

ـ ئەمجارە بە ئارەزووی خۆمە ! چەندم خەو بەم پلەی (چاك)ەوە ئەدی ! چەند جار لە دڵی خۆما ئەموت هەر کە پلەی ( چاك ) م وەرگرت ئەیبەم پیشانی دایکمی ئەدەم ، دڵی پێی خۆش ئەبێ ! ئاخ من زۆر چاك ئەزانم بۆ دایکم ناخوێنم . دایکم چەند جار ئەمەی پێوتووم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەرچەند کەمێکیشی بۆ ئەو بێ ،

هەر بۆ ئەو ئەخوێنم . دایکم ئەیەوێ کوڕەکەی پیاوێکی باشی لێ دەرچێ . ئەبێ ئەو ئاواتەی بە چاوی خـــۆی ببینێ هاتووەتەدیو سەری پێم بەرز ببێ . لەمەوپاشیش زیاتر پێش ئەکەوم و پلەی ( زۆر چاك ) وەرئەگرم . ئەوکاتە دایکیشم و پوورە ( زارا )یشم شانازیم پێوە ئەکەن . ڕاستە دایکم جاروبار بەسەرما دێ ، بەڵام ئەوەندەش لەگەڵم خراپ نی یە .

وەستایەوە ، لیستەی پلەکانی خستەوە ناو جانتاکەیو هەناسەیەکی بەسۆزی هەڵکێشاو ، وتی :

ـ هەست ئەکەی ؟ کێتێ بۆنی بەهار ئەدا . بەمنزیکانە بەهار دێت . ڕەشەمە وا دوایی دێ . ڕەشەمە دوا مانگی زستانە ، پاش ئەو هەرمێ پشکوانەو بەهارە . بەفر ئەتوێتەوە . ڕووی عەرز سەوز ئەبێ . ژیژك و مارو هەموو جانەوەران ڕاست ئەبنەوە . پەلەوەر ئەخوێنێ و گوڵ ئەپشکوێ .

لە یادم نەماوە چی تری لەبابەت بەهارو باڵدارانەوە وت . لەو کاتەدا بیرم لەوە ئەکردەوە بۆچی ئەم سەرگوزشتەیەمان نەخەمە سەر قاقەز ؟ لەوڕۆژەوە دەسم کرد بە نووسینەوەی . هەر ڕۆژی کەمێکم لێ ئەنووسی یەوە . لەگەڵ ئەوەشا لە باسی شتە بنچینەیی یەکـــان بەولاوەم نەئەنووسی . کـــە لێبوومەوە ساڵی خوێندنیش بڕابووەوە منیش و ( کوردە )یش سەرکەوتبووین بۆ پۆلی پێنجەم . هەردوکمان پلەی ( زۆر چاك )مان وەرگرتبوو .

ئەمە هەموو ئەوە بوو کە ویستم بینووسمەوە .

# لە بارەی ئەم کتێبەوە

- ناوی ڕاستەقینەی ئەم کتێبە « ڤیتیــا مالیێڤ لە ماڵو لە قوتابخانەدا »یە . قارەمانانی چیرۆکەکە هەموو ڕووسن‌و ناوەکانیان لە کتێبە ئەسڵی‌یەکەدا دیارە ڕووسی‌یە . من لەســەر داوای دەزگای هاوکاری ، کە یارمەتی‌ی لەچاپدانی ئەم کتێبەی داوە ، ناوەکانیانم کرد بە کوردی‌و ناوی کتێبەکەشم کورت کردەوە .
- ئەم کتێبەم لە ساڵی ١٩٦٣دا کردووە بە کوردی . وێنەکانیشیم لە چاپە عەرەبی‌یەکەی وەرگرتووە . لەوکاتەوە تا ئێستا هــەر بەئاواتی لەچاپ‌دانیەوەم ، بەڵام دەسەڵاتم نەبوە . ئێستاش کە بەم‌جۆرە لەچاپ ئەدرێ ، ئەو لەچاپ‌دانە نی‌یە کە بە دڵی خۆم بێ . من حەزم ئەکرد پیتەکانی تازەو ساغ‌و ، دەرچوونەکەی کەڵێ قەشەنگتر بێ . . بەڵام هەرچۆن بێ لەوە باشترە کە لەچاپ نەدرێ
- من لام‌وایە ئەم کتێبە بۆئەوە دەست‌ئەدا وەزارەتی پەروەردەکردن بە دەیان هەزار دانەی لێ لەچاپ‌داو بەخۆڕایی بەسەر قوتابی‌یانی پۆلی ٣-٦ی سەرەتایــیدا ببەخشێتەوە . بۆیە ئەگــەر ڕۆژێ لە ڕۆژان بــۆم بلوێ ، چاپێکی‌تری بە ئارەزووی دڵی خــۆم ئەکەمەوە .
- ئێستاش هیوام ئەوەیە هەر باوکێك ئەیکڕێ یا خۆی بۆ مناڵە قوتابی‌یەکانی بخــوێنێتەوە ، یا بی‌یان‌داتێ خۆیان بیخوێننەوە . هەروەها هەر قوتابی‌یەکیش دەستی کەوت بیدا بە ئاوەڵەکەی بیخوێنێتەوە .

| دێر | لاپەرە | چەوت | دروست |
|---|---|---|---|
| ٢١ | ١٠١ | دەرئەگات | دەرئەكات |
| ٣ | ١٠٩ | حەزتاكەم | حەزناكەم |
| ١٠ | ١١٠ | ئەيكاوكە | ئەيكاو ، كە |
| ٢٢ | ١٥٣ | سبەينێ يش | سبەينێ يش |
| ١٤ | ١٧٢ | مالپشەوە | ماليشەوە |
| ١٣ | ١٨٢ | كلەييمان | گلەييمان |
| ٧ | ١٨٤ | بيتەوە | بيتەوە |
| ١٢ | ١٨٨ | ۆ | بۆ |
| ١٣ | ١٨٨ | ۆ | بۆ |
| ٦ | ١٩٦ | درزی | دەرزی |
| ٢ | ٢٠٢ | بگيرى | بگرى |
| ٤ | ٢١١ | بەدەستە وە | بەدەستەوە |
| ٤ | ٢١١ | گرتو تى | گرتو وتى |
| ٢٤ | ٢١٢ | بەسەيەكدا | بەسەر يەكدا |
| ٢٣ | ٢١٣ | هەوڵادنين | هەوڵدانين |
| ٢ | ٢١٩ | كۆمەڵێكيشان | كۆمەڵێكيشيان |
| ٩ | ٢١٩ | دواييبەكار | دوايى بە كار |
| ٢ | ٢٢٤ | رتبوو | گرتبوو |
| ١٠ | ٢٢٤ | بەپێچەوانە وە | بەپێچەوانەوە |
| ١ | ٢٢٨ | پێروزبايى يان | پيرۆزبايى يان |
| ١٣ | ٢٣٠ | كراوو | كرابوو |
| ٥ | ٢٣٤ | پرسبارەكە | پرسيارەكە |
| ٧ | ٢٣٧ | ناوەڵەكانمان | ئاوەڵەكانمان |
| ١١ | ٢٥٢ | لەناو خۆيا . | لەناوخۆيا |
| ١٩ | ٢٥٥ | كورد . | كوردە |

ШКОЛЬНАЯ БИБЛИОТЕКА

Н. НОСОВ

# ВИТЯ МАЛЕЕВ В ШКОЛЕ И ДОМА

*Повесть*

ПЕРЕВОД С АРАБСКОГО НА КУРДСКИЙ
МУХАММАД МУЛЛА КАРИМ

БАГДАД–ИРАК

1975

دانەی بە ٧٥٠ فلسە